م. ئە. حەسرەتیان

# یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لەسەردەمی نوێدا

وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە

حکومەتی هەرێمی کوردستان
مەڵبەندی کوردۆلۆجی

# یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا

م. ئە. حەسرەتیان
وەرگێڕانی لە روسییەوە
د. دلێر ئەحمەد حەمەد

چاپی یەکەم
سلێمانی ٢٠٠٧

کتێب : یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا

بابەت : مێژوویی

نووسینی : م. ئە. حەسرەتیان

کۆمپیوتەر : ئەڤین عوسمان ئەحمەد

هەڵەبڕی و وردبینی: مژدە ئەحمەد حەسەن

دیزاین : رەوەند ئەحمەد کەریم

پێداچوونەوەی زمانەوانی: د.کەمال عەلی

بەرگ : سۆران عەلی ئەمین

ژمارەی سپاردن : (١٠٣٢) ی ساڵی ٢٠٠٧

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٢٠٠٠ دینار

مەڵبەندی کوردۆلۆجی ( ٦ )

ناونیشان: گردی ئەندازیاران- گەڕەك: ١٠٥ کۆڵان: ٢٥ ژ.خانوو: ٤ ژمارەی پۆست: ٩٥

بەرامبەر ئوتێل بابل- کوردستان . سلێمانی - ژ.تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣ — ٣١٩٣١٧٥

# ناوەرۆك

# تورکیا: دەستووری ئایدیۆلۆجیا و ئایدۆلۆجیای دەستوور

د. رەفیق سابیر

## ١

دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک، لە ساڵی( ١٩٢٤) دا لەسەر وێرانەی ئیمپراتۆریای عوسمانی دامەزرێندرا. ناسیۆنالیزمی تورک هەر لەسەرەتاوە پرۆژەی دەوڵەتێکی داڕشتبوو کە لە سایەیدا جگە لە تورک و زمانی تورکی هیچ رەگەز و زمان و کولتوورێکی تر مافی بوون و ژیانی نەبێت. تورکبوون، تەنیا بناغەی ئایدیۆلۆجیای ناسیۆنالیزمی تورک نەبوو، بەڵکو دواتر کرایە پێوەری هاووڵاتیبوون و تورکیزمیش گۆڕدرا بە تاکە کولتووری سیاسیی زاڵ و ئاینی نوێی دەوڵەت.

ئاشکرایە ئەم پرۆژەیە لە ولاتێکی فرەنەتەوە و فرەزمان و فرەئاین وفرە مەزهەبی وەک تورکیادا، کە ئەو کاتە تورک لە نیوەی دانیشتوانی ئەو ولاتە نوێیە کەمتر بوون، کارێکی سەخت و تەنانەت مەحاڵیش بوو. بەڵام دەوڵەتی تورکیا، بە رابەری (مستەفا کەمال) هەموو توانایەکی تەرخان کرد تا "باخچەی تورکیا" بەو جۆرە رێک بخات کە ئایدیۆلۆجیستانی ناسیۆنالیزمی تورک نەخشەیان بۆ کێشابوو. بۆیە بە پێی "تیئۆری باخچە" غەیرەتورک کرانە ئەو گژوگیا بێفەڕەی کە بۆ رێکخستن و جوانکردنی "باخچەکە" دەبوو لەناو ببردرێن، تورکیایش گۆڕدرا بەو جیوگرافیا بەرتەسکەی کە جگە لە تورک جێگای هیچ رەگەزێکی تری تێدا نەبێتەوە.

تورکەکان پێشتر، لە ساڵی (١٩١٥)دا، لە کوشتاری ئەرمەندا زیاتر لە ملیۆنونیوێک کەسیان لەناو برد بوو، کەچی بێ سزا دەرباز بوو بوون. ئەوان بە غرور و بڕوابەخۆبوون و توندوتیژییەکی کەموێنەوە دەستیان بە جێبەجێکردنی سیاسەتی بەتورککردن و لەناوبردنی گەلانی نێو تورکیا کرد. بەڵام ئەم سیاسەتە دەبوو لە سەرەتاوە رواڵەتێکی دەستووری و "رەوا"ی پێ بدرێت و بە یاسا پشتئەستوور بکرێت. یەکەمین دەستووری تورکیا، کە لە (٢٠) ی نیسان (ئاپریل) ی ساڵی (١٩٢٤)دا لە لایەن ئەنجومەنی بەرزی نەتەوەیی تورکیاوە پەسند کرا، پوختەی ناوەرۆکی ئایدیۆلوجیا و ئامانجی ناسیۆنالیزمی تورکی تێدا چەسپێندرا. بە پێی ئەو دەستوورە،بۆ نمونە: *هەموو تورکێک بە ئازادی لە دایک دەبێ (مادەی ٦٨). هەموو تورکەکان بەرامبەر بە یاسا یەکسانن (مادەی ٦٩). هەموو دانیشتوانی تورکیا بە بێ جیاوازیی ئاینی و نەژاد، گشتیان تورکن (مادەی ٨٨).*"* دوای ئەم مادانە و چەندین مادەی تری دەستووری و یاسایی جۆراوجۆر، کە ناوەرۆکێکی رەگەزپەرستانەیان هەبوو، ساڵی (١٩٣٠) پوختەی سیاسەتی رەسمیی دەوڵەت، لە زمانی وەزیری داد (مەحموود عیزەت بێگ) بەم جۆرە راگەیەندرا: "*تورک گەورەیە، تاقە خاوەنماڵی وڵاتە، ئەوەی بە رەگەز تورکێکی خاوێن و پاک نەبێ تەنها یەک مافی لەم وڵاتەدا هەیە ئەویش ببێتە خزمەتکار.*" *

پاش ئەوەی بە پێی یاسا کوشتنی زمان و کولتووری نەتەوە غەیرە تورکەکان رەوا کرا، نۆرەی سەپاندنی زمانی تورکی و یاساخکردن و کوشتنی زمانانی تری نێو تورکیا هات. هەر جۆرە بەرهەڵستییەکی ئەم سیاسەتە بە توندترین شێوە وەڵام دەدرایەوە. لە کوردستاندا، کە خەڵک داکۆکی لە زمان و کولتووری خۆی دەکرد، لەشکری تورکیا دەستی بە کوشتاری بە کۆمەڵی کورد کرد و سەدان هەزار خێزانی کوردیشی بە زۆرەملێ بۆ دەرەوەی کوردستان راگوێزا، تا لەناو کۆمەڵی تورکدا بتوێنەوە. سیاسەتی زمانی و نەتەوەیی دەوڵەتی تورک و تاوانەکانی لە کوردستاندا تێز و مۆدێلێکی نوێیان بۆ دنیا خستە روو، کە

پوختەی ئەوەیە: سنووری نێوانی کوشتنی زمان و کولتوورێک (کولتوور ساید) و نێوان جینۆ سایدی نەتەوەیەک تەنیا هەنگاوێکە. ئەوانەی بڕیار دەدەن زمان و کولتووری نەتەوەیەک بکوژن، دەشتوانن، ئەگەر گەیشتن بەم ئامانجە بخوازێت، نەتەوەکەیش جینۆساید بکەن. ، ئەم مۆدێلەی تورک بۆ چارەسەری کێشەی ئەرمەن و کورد دای هێنا، بیست ساڵێک دواتر نازیستەکانی ئەڵمانیا بەرامبەری جولەکە و قەرەجەکانی ئەلمانیا و ئەوروپا دووبارەیان کردەوە.

ئەم سیاسەتەی دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک، لە بنەڕەتدا پشت بە ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم دەبەستێت، کە ئایدۆلۆجیایەکی رەگەزپەرستانە (راسیستانە)یە.

رەگەزپەرستی لە دوو فۆرمدا خۆی دەردەخات: بایۆلۆجی و کولتووری. فۆرمی بایۆلۆجیی رەگەزپەرستی، باوەڕی بە قەدەرییەتی بایەلۆجی هەیە (چارەنووسی ئێمە لە لایەن بایالۆجیاوە دیاری کراوە)**، بۆیە بە گوێرەی ئەم مۆدێلە مرۆڤ و گەلان بە پێی رەگەزەکانیان پۆلێن دەکرێن و جیاوازی لە نێوانیان و لە مافەکانیاندا دەکرێت. رەگەزی سپی، لە هەموو رەگەزەکانی تر، بە گرنگتر و باڵاتر و داهێنەرتر دادەندرێت. ئەم جۆرە رەگەزپەرستییە وەک ئایدیۆلۆجیا، سەرەتا لە ئەوروپادا، دەرکەوت. پرۆسیسی کۆلۆنیالیزم لە ئەوروپادا پێویستی بە ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسی و بەهانەیەکی ئەخلاقی و کولتووری هەبوو تا بتوانێت رەوایی بە خۆی بدات. بەهانەکەیش ئەوە بوو ئەو گەلە کۆلۆنیلکراوانە، کە سەر بە رەگەزی تر بوون و رەنگی پێست، یان فۆرمی جەستەیان جیاواز بوو، بە دواکەوتوو و دڕندە وێنا کران، چەوسێندرانەوەو ئەو جۆرە مافانەیان پێ رەوا نەبینرا کە پێست سپییەکان (ئەوروپاییەکان) هەیان بوو. لە هەمان کاتدا پرۆسەی کۆلۆنیالیزمیش وەک کارێکی شارستانی، کە دەیەوێت ئەو گەلانە فێری شارستانی و مەدەنییەت بکات، وێنا کرا. ئەم دیاردەیە لە ئەوروپادا، دوای تێکشاندنی نازیزمی ئەڵمانیا، لە شەڕی دووەمی جیهاندا، دوایی هات. لە سەرەتای نەوەتەکانیش، دوا قەڵای رەگەزپەرستیی بایەلۆجی لە

باشووری ئەفریقادا هەرەسی هێنا. کەچی رەگەزپەرستیی کولتووری، گەلان و مرۆڤەکان بە پێی جیاوازیی ئێتنیکی و کولتووری پۆلێن دەکات و جیاوازیی لە مافەکانیاندا دەکات. لە هەمان کاتدا زاڵبوون و کۆنترۆڵکردنی کولتوور و زمانێک و لەناوبردنی کولتوور و زمانێکی تر بە رەوا دادەنێت. نووسەر و توێژەری فینلەندی (تۆڤێ سکوتناب کانگاس) ئەم جۆرە رەگەزپەرستییە بە ئێتنیسیزم (Ethnicism) و لینگڤیسیزم (Lingvicism) ناو دەبات و دوڵەتی تورک بەوە تاوانبار دەکات کە ئەم شێوە رەگەزپەرستییە بەرامبەری کورد و زمان و کولتووری کوردی پەیڕەو دەکات.***

## ٢

ناسیۆنالیزمی تورک (کەمالیزم) کە هێشتا ئایدیۆلۆجیای دەوڵەتی تورکە، بە درێژایی ئەو ماوەیە نەیتوانی نە نەتەوەیەکی هۆمۆجین و نە پێناسە (ئایدێنتیتی)یەکی نەتەوەیی یەکگرتوو دروست بکات. ئیمڕۆ تورکیا، وەک هەشتا ساڵ پێش ئێستا، رووبەڕووی قەیرانی پێناسە بۆتەوە. تورکیا هێشتا بە وڵاتێکی فرەنەتەوە و فرەکولتوور و فرەزمان ماوەتەوە. زۆرن ئەوانەی هێشتا تورکبوون بۆ ئەوان، کە بە زەبری ئایدیۆلۆجیا و قامچی بە سەریاندا سەپێندراوە ، نەک هەر مایەی بەختەوەری و شانازی نییە، بەڵکو سەرچاوەی بەدبەختی و مایەی نەفرەت و نەگبەتییە. ئیمرۆ ئەو کولتوور و زمانە جیاوازانە، وەک نوێنەری نەتەوەکانی نێو تورکیا، لە پێش هەموویانەوە کولتوور و زمانی کوردی، هەوڵ دەدەن ناوەرۆکێکی سیاسی بە خۆیان بدەن و پێناسەی نەتەوەیی ئەو خەڵکانە دەرببڕن کە هەشتا ساڵە پێناسەی نەتەوەییان دەکوژرێت.

قەیرانی پێناسە و قەیرانی کولتووری و سیاسیی دەوڵەتی تورکیا لە کەمالیزمەوە، کە ئایدیۆلۆجیایەکی رەگەزپەرستانەیە بەرامبەر نەتەوە غەیرەتورکەکان، سەرچاوەیان گرتووە. دوژمنایەتیی ئەم ئایدیۆلۆجییایە لە گەڵ

ئاینی ئیسلام و کولتووری ئیسلامی و هەر کولتوور و ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسیی جیاوازدا، رواڵەتێکی تری رەگەزپەرستیی کەمالیزم دەردەخات. ئایدیۆلۆجیایەکی لەم جۆرە ناتوانێت فاشیستی نەبێت.

بەڵام ئیمڕۆ پرسی کورد و نەتەوەکانی تر و پێناسەی ئیسلامیی کۆمەڵی تورک، بۆ دەوڵەتی تورکیا، وەک برینی (پاژنەی ئەشیل)یان لێ هاتووە و بە توندی تەحەدای ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم دەکەن و پێناسە و یەکبوونی تورکیایان خستۆتە ژێر پرسیارەوە. ئایا ئەو دەوڵەتەی کەمال ئەتاتورک دروستی کرد، وەک ئیمپراتۆریای عوسمانی، لە لم و لە سەر لم هەڵچندراوە و سەرەنجام هەرەس دەهێنێت، یان شتێکی ترە؟ بە رای من سیاسەتی لەمەودوای دەوڵەتی تورکیا خۆی دەتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. ئایا تورکیا بە راستی دەیەوێت تێکەڵاوی ئەوروپا و دنیای مۆدێرن ببێت و دیاردەی فرەکولتووری و فرەزمانی و فرە نەتەوە و ئاینی قبووڵ بکات و بە مایەی دەوڵەمەندیی کولتووری و شارستانیی دابنێت، یان وەک رابردوو سەروەری و بوونی خۆی لە کوشتنی ئەو نەتەوە و زمان و کولتوورانەدا دەبینێتەوە؟

ئیمڕۆ تورکیا، وەک تاکە قەڵا و دوا قەڵای رەگەزپەرستی لە دنیادا ماوەتەوە. ئایا لە دنیای ئیمڕۆدا، کە مافی مرۆڤ و ئازادیی زمانی و کولتووری بوونەتە بەهای گەردوونی، دەکرێت دەوڵەتێک بە ئایدیۆلۆجیایەکی رەگەزپەرستانەوە داهاتووی هەبێت. باوەڕ ناکەم. چونکو رەگەزپەرستی، بایۆلۆجی بێت، یان کولتووری و زمانی، تاوانێکە بەرامەری مرۆڤایەتی و لەوە زیاتر نە گەلانی نێو تورکیا و نە جیهان دەتوانن قبووڵی بکەن.

## ٣

ئێستا لە تورکیادا هێزی نوێی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەرکەوتوون و چاویان لە گۆڕانکاری و داهاتوو بڕیوە. هەڵبژاردنەکانی هاوینی ساڵی(٢٠٠٧)و ئەنجامەکانی، هێز و ویستی ئەو هێزە نوێیانەی نێو تورکیا پیشان دەدەن. ئەم

هەڵبژاردنانە، بە رای من، تەنیا دەنگدانێک نەبوو بۆ هەڵبژارنی ئەندامانی پەرلەمانی تورکیا و سەرۆک کۆمار، بەڵکو راپرسییەکیش بوو لە بارەی کەمالیزم و داهاتووی کەمالیزم. سەرکەوتنی پارتی داد و گەشەپێدان لەو هەڵبژاردنەدا، خۆی لە خۆیدا، هەڵاتنی زۆرینەی گەلی تورک و گەلانی تری تورکیایە لە کەمالیزم. چونکو تەنیا گەلانی غەیرەتورک لە دۆزەخی کەمالیزمدا نەسووتێندراون، بەڵکو گەلی تورک خۆی قوربانییەکی دیکەی کەمالیزمە.

هەشتا ساڵە کەمالیزم وەهم و خورافە و لوتبەرزیی نەتەوەیی لە کۆمەڵی تورکیادا دەچێنێت، هەشتا ساڵە کەمالیزم خەڵکی تورک فێری رەگەزپەرستی و رقبوونەوە لە غەیرەتورک و بەسووکڕوانین بۆ زمان و کولتووری لە خۆی جیاواز دەکات. من نەتەوە و کۆمەڵێک ناناسم هێندەی تورک هەستی شۆڤێنیستی لە نێودا بەهێزبێت. ئەو تورکانەی کە تەنانەت لە ئەورووپا دە ژین قبووڵ ناکەن مرۆڤ کورد بێت. منداڵانی تورک، کە لە ئەورووپا لە دایک دەبن، زۆرینەیان هەر لەساڵی یەکەمی خوێندنیانەوە، بە گژ ئەو منداڵە کوردانەدا دەچنەوە کە، لە پۆلەکانیاندا، کوردبوونی خۆیان رادەگەیەنن. شەڕی نێوان منداڵانی تورک و کورد، لەسەر پێناسەی (ئایدێنتیت)ی کوردبوون، لە نێو منداڵانی هەندێک قوتابخانەی ئەورووپادا، هێندەی شەری ئەمریکا و ئەلقاعیدە ناسراوە!! بە کورتی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم و پرینسیپەکانی بە جۆرێک تێکەڵاوی ژیان و پەروەردەی تاک و کۆمەڵی تورک و ژیانی سیاسی و کولتووریی تورک بوون کە کۆمەڵی تورکی گۆریوە بە کۆمەڵێکی نەخۆش، کۆمەڵێک کە ناتوانێت پێداویستییەکانی ئەندامانی، لەوانە پێداویستیی زمانی و کولتووری، دەستەبەر بکات و مافی ژیان و ئازادی بە خەڵکی غەیرەتورکی وڵاتەکەی بە رەوا بزانێت.

پێدەچێت، ئیمڕۆ، زۆرینەی گەلی تورک بە دوای هێزێکی سیاسیی عەقڵانیدا بگەڕێت کە لە رێگای سیاسەتێکی مۆدێرن و عەقڵانییەوە لە وەهم و بەڵای کەمالیزم و کولتووری رەگەزپەرستی و دژەئیسلامی رزگاریان بکات. ئایا

پارتی داد و گەشە پێدان دەتوانێت ئەو (گۆدۆ) چاوەڕوانکراوەی گەلی تورک بێت؟

بەڵام شکستهێنانی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم، وەک ئایدیۆلۆجیای دەوڵەت، بە تەنیا ناتوانێت گەلی تورک لە پەتای شۆڤێنیزم رزگار بکات و ئەو راستییەیان لەلا بچەسپێنێت کە گەلانی تری تورکیایش، وەک تورک، مافی ژیان و ئازادیی زمان و کولتووریان هەیە. چونکو کەمالیزم و پرینسیپەکانی بوونەتە بەشێکی هێندە گرنگ لە بیرکردنەوە و تێڕوانی کۆمەڵی تورک و بە جۆرێک بە ژیانی سیاسی و کولتووریی تورکیادا رۆچوون کە بە ئاسانی رێشەکێش ناکرێن. بۆیە لە داهاتوویشدا دەتوانن، بەم یان بەو شێوەیە، درێژە بە خۆیان بدەن و لە فۆرم و شێوەی نوێدا دەربکەونەوە.

بە رای من گرنگترین قەڵای ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم دەستووری تورکیایە، بۆیە سەرەتای شکستهێنانی راستەقینەی کەمالیزم بە گۆڕینی دەستووری تورکیا دەست پێ دەکات. چونکو ئەم دەستوورە، پێچەوانەی دەستووری هەر دەوڵەتێکی مۆدێرن، دەستوورێکی ئایدیۆلۆجییە و لە بنەڕەتدا لە کەمالیزمەوە سەرچاوەی گرتووە. دەستووری تورکیا خۆی رۆحی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم، لە فۆرمێکی یاساییدا، بەرجەستە دەکاتەوە. دەستووری تورکیا واتا کەمالیزم، کەمالیزمیش واتا دەستووری تورکیا. ئەو کەسەی گومانی لەم بۆچوونە هەیە دەتوانێت ئەم کتێبەی م. ئە. حەسرەتیان (یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد) بخوێنێتەوە کە هاوڕێم د. دلێر ئەحمەد، راگری کۆلێجی زانستییە مرۆڤایەتییەکان لە زانکۆی سلێمانی، لە رووسییەوە کردوویەتی بە کوردی.

وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ کوردی لەمڕۆدا کارێکی گرنگە بۆیە دەستخۆشی لە وەرگێر دەکەم. نووسەری ئەم کتێبە، کە کوردناسێکی ناسراوی رووسیایە و شارەزای تورکیایشە، بە وردی لە دەستوور و یاساکانی تورکیای کۆڵیوەتەوە و بە تایبەت لەو مادە و بەندانە راماوە کە پەیوەندییان بە کوردەوە هەیە. باسی ئەو ئەنجام و عاقیبەت و تاوانانە دەکات کە، لە تورکیادا، بە ناوی دەستوور و یاساوە

دژی کورد کراون. نووسەر لەم رووەوە زانیاری و ئاگاداریی فراوان و بە نرخ لە بارەی ناوەرۆکی دەستووری تورکیا و سروشتی دەوڵەت و ئایدیۆلۆجیای دەوڵەتەکە بە خوێنەران دەدات. هەروا ئەم کتیبە لە کاتێکدا کراوە بە کوردی و بڵاو دەکرێتەوە کە تورکیا لەبەردەم گۆڕانکاری دایە و پەرلەمانی تورکیا و حکومەتی (رەجەب تەیب ئەردوگان) پرۆژەی دەستوورێکی نویێ بۆ تورکیا ئامادە دەکەن. ئایا دەستووری نوێی تورکیا تا چەند دەتوانێت نائایدیۆلۆجیانە و مۆدێرن و دیموکراتانە بێت؟ تا چ ئەندازەیەک پرینسیپەکانی ئازادی و مافی مرۆڤ و ئازادیی زمانی و کولتووری و نەتەوەیی گەلانی دیکەی تورکیا لەخۆ دەگرێت؟

تورکیا هێشتا دەوڵەتێکی نیمچە میلیتارییە و عەسکەر ئەکتەرێکی گرنگی سیاسییە، بۆیە مرۆڤ ناتوانێت، لەمرۆدا، چاوەڕێی دەستوورێک بکات کە لە کولتوور و ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم شۆرابێتەوە. بەڵام دەستووری نوێی تورکیا چەند لەم کولتوور و ئایدیۆلۆجیایە دوور بکەوێتەوە، هێندە گەلی تورک روو لە ئازادی و پێشکەوتن و پشت لە شۆڤێنیزم و کولتووری رەگەزپەرستی دەکات.

---

*ئەم قسەیەی وەزیری دادی ئەو سەردەمەی تورکیا و دەقی مادەکانی دەستووری تورکیا لەم کتێبە (یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد) وەرگیراون.

** Tove Skutnabb-Kangas, Minoritet, språk och rasism, s.۲۰۲

*** هەمان سەرچاوە، لا. ۲۰۳

# پێشەکی

بە درێژایی هەموو قۆناغەکانی کۆماری، دەسەڵاتدارانی تورکیا هەوڵیان داوە نەک هەر دان بە بوونی کێشەی کورددا نەنێن، بەڵکو نکوڵیان لە بوونی نەتەوەی کوردیش لە وڵاتەکەدا کردووە. ئاماری تورکیا هیچ کات وێنەیەکی راستەقینەی پێکهاتەی نەتەوەیی وڵاتەکە نادات بە دەستەوە: لە فۆرمی ناونووسیندا پەیوەنداری (ئینتیما) ی نەتەوەیی تێدا نانووسرێ، بەڵکو لە جیاتی ئەمە زمانی دایك تۆمار دەکرێت. ئەمە جگە لەوەی بەهۆی بارودۆخی سیاسی تورکیاوە خەڵکی زۆرجار پێوەنداریێتیی نەتەوەیی خۆیان دەشارنەوە. هەموو ئەوانە فاکت و بەڵگەن بۆ ئەوەی بڵێین ژمارەی نەتەوە ناتورکەکان لە وڵاتدا گەلێ زۆرە. بۆ نموونە لە ناونووسییکردنی ساڵی (١٩٢٧) دا (بە ماکی زمانی دایك) کەمە نەتەوەکانی ویلایەتی ئەستەمبوڵ (بە کورد و چەرکەسەوە) نزیکەی لە (٢٧٪) دەبوون، نا موسوڵمانەکانیش لە (٣١,١٤٪) بوون ئەوەی جێگای سەرنجە لە (٣٪) لە خەڵکی ناموسڵمانی ئەو ناوچەیە دانیان بە زمانی رەسەنی خۆیاندا نا کە تورکیە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە تەنیا لە ویلایەتی ئەستەمبوڵدا. (٢١,٢٥) خەڵکی ناتورك حسابی تورکیان بۆ کرابوو. بەم شێوەیە بە پێی ئامار و ناونووسییکردنی خەڵکی لەسەر بنچینەیی زمانی دایك، ژمارەی دانیشتوانی کەمە نەتەوەییەکانی تری کەم کراوەتەوە. لە کاتێکدا بەر لە هەموو شت ئەم ئامارەی ساڵی (١٩٢٧) ناتەواو بوو، چونکە بەشێکی زۆری خەڵکی ئەو سەردەمە نەخوێندەوار بوون. ساختەکردن بە ناونووسکردن لەگەڵ هەندێ هۆکاری تر بوونە هۆی ئەوەی چەند ناوچەیەکی کوردنشین نەگرێتەوە. بەم شێوە سەرژمێری ساڵی (١٩٢٧) قەوارەی دانیشتوانی دەرسیمی بە (٢٧٠) هەزار کەس داناوە، بەڵام تەنها ناوچەکانی خۆزات، پێرتێك، چارسانجاك،

نەزیمیە، ئۆڤاجیك، مەزگیت، چەمش کزك، واتە ناوچەکانی ناوەند و هۆزەکانی دراوسێی گرتۆتەوە. کوردێکی زۆری ناوچەکانی کیگی، تولومور، ئێرزنجان، کێماخ، کوردوچای، کۆچگیری، دیڤیرگی، کۆچخیسار ناونووس نەکران.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی حکومەتی تورکیا لە ساڵی (١٩٣٨) دا دان بەوەدا بنێ کە لە دەرسیم (٥٠) هەزار کورد دەژین.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کە لە ساڵانی بیستەکاندا لە زۆربەی ناوچەکاندا تورك کەمایەتی بوون. کەمە نەتەوایەتییەکان لە ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا ڕێژەی لە (١٥,٣٪) ی پێك دەهێنا. کوردیش لە (٤٧٪) ی ناوچەکەی پێك دەهێنا. ئەمە گەواهی ئەوە دەدات کە کورد لەو پارێزگایانەی ناومان هێنان بە شێوەیەکی چڕ و بە یەکەوە دەژیان، لەوەش بترازێ لە چەند ویلایەتێکی تر کوردەکان زۆرینەی دانیشتوانیان پێك دەهێنا. بۆ نموونە لە ویلایەتی وان کورد لە (٧٧٪) ی دانیشتوانان بوون. لە پێکس و موش و سیرت لە (٧٥٪) ی بوون، لە دیاربەکر و هەکاری لە (٦٩٪)، ماردین لە (٦١٪)، ئێلیزیگ لە (٥٣٪) ، تا ساڵی (١٩٢٥) کوردەکان لێرە زۆرینە بوون. بەڵام دوای شکانی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران دەسەڵاتدارانی تورکیا زۆربەی کوردەکانیان بۆ ڕۆژئاوای تورکیا ڕاگواست و بەمەش ژمارەیان کەم بۆوە هەرچەندە دواتر سەرباری ئیجرائاتی ئیداری و پۆلیسی کە دەرهەقی ناوچەکەیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کورد هێشتا زۆرینەی دانیشتوانی وڵاتی پێکدەهێنا.

ئەم ئامار و ژمارانەی باسمان لێوە کرد لە ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا ئەوە دەردەخەن کە کەمە نەتەوەکان لە (٤٠٪) ناوچەکە پێك دەهێنن و کوردیش لەوانە لە (٣٧٪) دانیشتوانەکە پێك دەهێنێت. بەم شێوەیە لەم ناوچەیە کورد بە شێوەیەکی چڕوپڕ دەژیان و بەردەوام بوون لە پاراستنی تایبەتمەندی و زمانی ڕەسەنی خۆیان و مافی ئەوەیان هەبوو ئەو هەقە بە خۆیان بدەن سەربەخۆیی ئابووری، کۆمەڵایەتی وکولتووریی خۆیان بپارێزن و گەشەیان پێبدەن، بەڵام سیاسەتی کۆنەپەرستانەی حکومەتی تورکیا بەردەوام مافەکانی گەلی کوردی پشتگوێ خستووە و ڕێگر بووە لە بەردەم هیوا و ئامانجەکانیدا.

# بەشی یەکەم
# یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و رەوشی کورد
# لە ساڵانی بیستەکان و سییەکاندا

لە ساڵانی بیستەکان و سییەکاندا بزاڤی کوردی لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا بەردەوام بوو. کۆمەڵێك فاکتەر بەردەوام زەمینەیان بۆ جوڵانەوەکە خۆش دەکرد و رەوایەتییان پێ دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکانی حکومەتی تورکیا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە کاری ئیداری و عەسکەری زیاتری بڕ نەدەکرد. هاوکات یاسای جۆراوجۆر بە شێوەیەك دادەڕێژران کە کت و مت بۆ دژایەتیکردن و لە ناوبردنی جوڵانەوەی کوردی بوو لە تورکیا.

لە رۆژانی (١٥-٢٣) ی تەموزی (١٩١٩) دا کۆنگرەی ئەرزرۆم بەڕێوە چوو. کێشەی کورد لەم کۆنگرەیەدا بابەتی سەرەکیی لێدوان و گفتوگۆ بوو. بەڵام لە بەیاننامەی کۆتایی ئەم کۆنگرەیەدا تورکە ناسیۆنالیستەکان بە هیچ جۆرێك باسیان لە مافی گەلی کورد نەکردو بە تەواوی خۆیان لەم کێشەیە کەڕکرد و دزیەوە ، جگە لەمەش تورکە رەگەز پەرستەکان توانیان بڕیارێکی وا دەربکەن کە گشت موسوڵمانان ناچار بکەن، لەوانە کوردیش، خەبات لە دژی جیابوونەوەی رۆژئاوای ئەرمێنیا و باکوری کوردستان لە دەوڵەتی تورکیا بکەن.

هەروەك لە بەیاننامەی کۆنگرەکەدا هاتووە: ((ویلایەتەکانی ئەرزرۆم، سیواس، دیاربەکر، خەرپوت، بەتلیس، کۆی گشتیان یەك شتن و بە هیچ جۆرێك و بە هیچ بیانوویەك نابێ لە ئیمپراتۆریای عوسمانی جیابکرێنەوە.

موسوڵمانان کە لەسەر ئەم خاکە دەژین و لە گروپ و نەتەوەی جیاجیا پێکهاتوون و خاوەن تایبەتمەندی جیاوازن، بە گشتی هەموو ئەو ماك و رەگەزە ئیسلامیانە بە جۆرێ تەماشا دەکرێن وەك برای یەکتر و لە یەك خێزان لە دایك بووبن (١٦،لا،٣٨١) ئەم جۆرە پان ئیسلامیزمە بۆ تورکە ناسیۆنالیستەکانی ئەو سەردەم پێویست بوو تا یاری بە هەست و سۆزی ئاینیی خەڵك بکەن و کەمینە موسوڵمانەکانی تر بە دەوری خۆیاندا کۆبکەنەوە، وەك (کورد، چەرکەس، لاز،......... هتد) تا دژی بێگانەی دەست درێژکەر و مەسیحییەکانی ناو وڵات بەکاریان بهێنن .

هەر لێرەدا ئەوەی پەیوەندی بەم باسەوە هەیە بڕیاردانی کۆنگرەی کۆمەڵەی داکۆکیکردن لە مافەکانی ئەنادۆڵ و رومێلی کە لە(٤) تا(١٢/٩/ ١٩١٩)بەسترابوو، دەخەینە ڕوو. بۆ نموونە لە بەیاننامەکەدا هاتووە کە کەمالیستەکان بڕیاریان لەسەر داوە بە تایبەت لە کۆنگرەی سیواس لە( ١١/٩/١٩١٩ )کە ئاراستەیەکی دژە ئیمپریالی هەبوو بەڵام بە روحێکی ناسیۆنالیستانە سەرشۆڕ ببوو. بە تایبەت لە پشتگوێ خستنی مافی کەمە نەتەوەییەکان لەوانە کورد.

لەم دۆکومێنتەدا هاتووە: رووبەری ئیمپراتۆریای عوسمانی کە دانیشتوانەکەی بە زۆری موسوڵمانن و لە (٣٠) ئۆکتۆبەری ( ١٩١٨) دا واتە لەو رۆژەی کە ئاشتی تێدا ئیمزا کراوە، هەر لە چوارچێوەی سنووری ئێمەدا دەمێنێتەوە و بریتییە لە یەکەیەکی گشتی، نابێ هیچ بەشێکی لە دەوڵەتی عوسمانی لێ جیابکرێنەوە جا بە هەر هۆکار و لە ژێر هەر دروشمێك و بیانویەکدا بێت (٢١، لا، ١٢٧) .

بڕیارەکانی کۆنگرەی ئەرزرۆم و سیڤاس بوونە بنەمایەك بۆ ئەنجوومەنی نەتەوەیی کە لە ساڵی (١٩٢٠) دا لە لایەن پەرلەمانی ئیستەمبوڵەوە بڕیاری لەسەر درابوو، زۆربەی پەرلەمێنتارەکان پشتگیریان لە بۆچوونەکانی کەمالیستییەکان کردبوو.

لە مادەی یەکەمی ئەنجوومەنی نەتەوەییدا هاتووە: بەشێکی ئیمپراتۆریای عوسمانی کە کەوتۆتە هەردوولای هێڵی رێککەوتننامەی مودرۆس و ئاشتی، کە خەڵکی تورک موسوڵمانی بە زۆری تێدا نیشتەجێن و بە ئاین و کولتوورەوە بە یەکەوە بەستراونەتەوە و بۆ یەك ئامانج هەوڵ دەدەن، بریتیین لە یەکێتی و یەك کۆی گشتی کە قبووڵ نیە و ناکرێ لە ژێر هەر فاکتەر و هۆکارێکدا جا یاسایش بێت پارچە پارچە بکرێت. (٣٢، لا، ٥٢).

ئەو پرینسیپانەی کە لە ئۆیێتی نیشتمانیدا دارێژران ئیدی بوونە بنەمایەك بۆ کارو چالاکییەکانی تورکە ناسیۆنالیستەکان، هەر بەم بۆنەیەوە قسەیەکی بەناوبانگی کەمال ئەتاتورك هەیە کە لە یەکی مارتی (١٩٢٢) دا وتویەتی : (هێڵی سەرەکی کارکردنمان لە بوارەکانی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەدا بریتییە لە بنەماکانی ئۆیێتی نیشتمانی).

بڕیارەکانی کۆنگرەی ئەرزرۆم و سیواس کە لە لایەن ئۆیێتی نیشتمانییەوە پەسەند کران، بەو مانایە دێت کە ئیدی کەمالیستەکان بێ گوێدانە بەڵێنەکانیان ئامادە نەبوون مافی ئۆتۆنۆمی بدەنە کوردەکان لەناو تورکیای نوێدا و دانیان بە مافە نەتەوەیەکانیاندا نەنا، هەوڵیان دا خەباتی رزگاریخوازییان بۆ خزمەتکردنی جوڵانەوەی نەتەوەیی تورکی بەکاربهێنن، بۆ ئەم مەبەستەش دروشمی یەکێتی ئاین و کولتوور وەك ئامانجێك بەکاردەهێنران . ئەم جۆرە سیاسەتەی کەمالیستەکان نەك هەر نەیانتوانی ببنە رێگر و کۆسپ لە بەردەم پرسی کوردیدا، بەڵکو بوونە هۆکاری سەرەکێش بۆ ئەوەی جوڵانەوەی کوردی لە سەردەمی نوێدا دەست پێ بکات. لە بارودۆخێکدا کە گوتارەکان بەردەوام دژی دەسەڵاتدارانی ئەنقەر بوون، ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا چەند یاسایەکی دەرکرد بۆ سزادانی هەر جۆرە گوتارێك دژی کەمالیستەکان بێت.

بەم شێوەیە لە ئەپریلی (نیسان) (١٩٢٠) دا (ئەنجوومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا) یاسای لە بارەی تاوان و خیانەتی نیشتمانی دەرکرد. یاسای ژمارە (٢) دەڵێ: هەر کەسێك یاخی ببێت یا هەر جۆرە شتێکی تری لەم بابەتە ئەنجام بدات جا بە قسەکردن یاخود کاری چاپ و بڵاوکردنەوە بێت دژ بە دەسەڵاتی ئەنجومەنی بەرزی نیشتمانی کە دەسەڵاتێکی یاساییە و گەر بە مەبەستی ئازادکردنی خەلیفە و سوڵتان و رزگارکردنی

خاکیش دروست بوویێت هەروەها بۆ بەرپەرچ دانەوەی هەموو جۆرە هێرشێك بۆ سەر وڵات بە خیانەت حسێب دەکرێت. (مادەی یەکەم) : هەر کەسێك تاوانێك دژی نیشتمان ئەنجام بدات سزاکەی هەڵواسین و لە سێدارەدانە (٧، لا٤٧- ٥) I,I م، ٢) ئەم یاسایە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە دژی کوردە شۆڕشگێڕەکان بەکاردەهێنران، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئەنقەرە پێیان وابوو هێشتا کەمە، لەبەرئەوە لە (١١) ی ئەیلولی (١٩٢٠) دا ئەنجومەنی باڵای نیشتمانی یاسای ژمارە (٢١) دا لە بارەی سەربازە هەڵاتووەکانەوە پەسەند کرد.

بە گوێرەی ئەم یاسایە دادگەی سەربەخۆیی دامەزرێندران کە لە ئەندامانی ئەنجومەنی بەرز پێکهاتبوون و دەبوایە بە پێی دەق و یاسا مەدەنی و عەسکەرییەکان حوکم بدەن و لە هەر حاڵەتێکیشدا ئەگەر پێویست بکات بە پەلە دەتوانن سزای سەربازە هەڵاتووەکان و ئەوانەی هاوکاریان کردوون بدەن. مادەی یەکەم ((م.I)) حوکمەکانی دادگەی سەربەخۆیی یەکلاکەرەوە بوون و هەموو دەسەڵاتەکانی مەدەنی و عەسکەری دەبوایە جێبەجێیان بکەن ( ٧، ب I، لا، ٦١) دواتر پێکهاتەی دادگەی سەربەخۆی زیاتر گەورە و فراوان کران. لە تەمووزی (١٩٢٢) ئەنجومەنی بەرز یاسای ژمارە (٢٤٩) ی پەسەند کرد کە دەربارەی تۆمارکردنی هەموو سیستێمەکانی دادگەی سەربەخۆیی بوون.

بە گوێرەی یاسای نوێ و بە ئامانجی بنبڕکردنی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردی لە کانونی دووەمی (١٩٢٣) دا دادگەی تایبەت بە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات دامەزرێندران یان دروست کران کە سەنتەرەکەی لە دیاربەکر بوو.

لە ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٢٣) دا ئەنجومەنی بەرز یاسای ژمارە (٣٥٦) ی دەربارەی لەناوبردنی باندیزم (چەتەگەری) پەسەندکرد کە لە لایەن وەزیری ناوخۆ، مەلحی بەگەوە ئامادەکرابوو، لە کاتی لێدوان لەبارەی پرۆژە یاساییەکە لە نێوان ئەندامانی پەرلەمان و وەزیری ناوخۆ لۆمە و گلەیی وەزیریان کرد کە لە کاتی ئەنجامدانی کاری دژ بە (باندیزم) دا چەتەگەری یاسای پشتگوێ خستبوو.

پەسەندکردنی ئەو یاسایە سزاکانی چ لەسەر (باندیزم) ە چ لەسەر لایەنگری کردن و شاردنەوەی باندەکان بەهێزتر کرد (٧، ب٥، ٦، لا٣٨٤، ٣٨٥) . زۆربەی ئەندامانی پەرلەمان پشتگیری ئەم یاسایەیان کرد.

بەڵام هەندێ لە ئەندامانی پەرلەمان کە سەر بە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بوون پشتگیریان نەکرد. بۆ نموونە فەرەیدون فیکری بەگ کە نوێنەری ناوچەی دەرسیم بوو وتی : وەزیری ناوخۆ بە ئاشکرا وتی کە: من هیوادارم ئەم یاسایە پەسەند بکرێت کەس لە هاوکارانمان لە دژی نەوەستا. لەم حاڵەتەدا بۆچی ئێوە ئێمە لە کێشە وەردەدەن، ئێمە تێکەڵاوی ئەمە مەکەن، چیتان دەوێ بۆ خۆتان بیکەن (١٩٣. ct. ٢٣) ئەو یاسایانەی لە سەرەوە باسمان کردن دەسەڵاتدارانی تورك بە شێوەیەکی بەرفراوان دژی بەشداربوانی جوڵانەوەی کوردی بەکاری دەهێنان، کوردە شۆڕشگێڕەکان لە لایەن رۆژنامەگەری تورکییەوە بە (باند) ناودەبردران، سیاسەتی پشتگوێ خستنی مافەکانی گەلی کورد و سیاسەتی تورکە نەتەوە پەرستەکان بە تەواوی لە دەستوری یەکەمی کۆماری تورکیادا رەنگی دابۆوە کە لە لایەن ئەنجومەنی بەرز لە (٢٠) ئەپریلی (١٩٢٤) دا پەسەندکرابوو، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لێرەدا بڕگەی داهاتوو ببینین:

هەر تورکێك چ ژن یان پیاو بگاتە تەمەنی (٣٠) ساڵی دەتوانێ خۆی کاندید بکات (مادەی ١١) دوای ئەوەی سەرۆك کۆمار هەڵدەبژێردرێت ئەم سوێندە دەخوا:

- بەڵێن دەدەم بە شەرەفم کە تا لە پۆستی سەرۆك کۆماری دابم یاسا و بنەماکانی کۆماری و ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی لەبەرچاو بگرم و داکۆکیان لێ بکەم، بە وێژدانێکی ئاسودەوە و بە هەموو هێزمەوە لە پێناو بەختەوەری نەتەوەی تورکدا کاربکەم (٢لا، ٢٦٩، ٢٨٠، م٣٨).

لە بارەی سەرکوتکردن و دان پیانەنان بە کەمینەکانی تر بڕگەیەکی تری دەستوور شایەتی دەدات:

مادەی دووەم دەڵێ : -(زمانی تورکی بە زمانی دەوڵەت دادەنرێت)

ئەمە مانای ئەوەیە رۆژنامەی رەسمی ولات دەبێ بە زمانی تورکی بێت، بە کورتی ئەم بڕیارە پشتگوێ خستن و لەناوبردنی بچوکترین مافە سەرەتاییەکانی میللەتان یان نەتەوە بچوکەکانی ناو تورکیایە.

جگە لە سەپاندنی زمانی تورکی بەسەر هەمواندا، دەسەڵاتداران هەوڵیان دەدا رێ لە گەشەکردنی بوارەکانی روحی میللەتە بچوکەکانیش بگرن و هەر لە تاریکیدا بیانهێڵنەوە، هەروەك لە دەستووردا هاتووە و دەڵێ:

- هەموو تورکێك بە ئازادی لە دایك دەبێ / مادە (٦٨)
- هەموو تورکەکان بەرامبەر بە یاسا یەکسانن / مادە (٦٩)

ئەدی لەگەڵ میللەتانی ناتورك دەبێ چۆن بێت؟ لەگەڵ کەمە نەتەوەکان؟ لەگەڵ کوردەکان ؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا مادەی ( ٨٨) لە دەستووری تورکیدا بە ئاشکرا دێتە گۆ:

(هەموو دانیشتوانی تورکیا بە بێ جیاوازیی ئاینی و نەژاد گشتیان تورکن)

بەڵام هەموو ئەمانە لە ناوەڕۆکدا نەیانتوانی جیاوازی نەتەوەکان بگۆڕن کە لە تورکیا دەژین و نەیاندەویست و نەیانتوانی ببنە تورك، کوردەکانیش نەیانویست ببنە تورك و درێژەیان بە خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەیی خۆیاندا لە پێناو سەربەخۆیی و مافی چارەی خۆنوسین دژی دەسەڵاتی تورکی باڵادەست.

زۆر لە مادەکانی تری دەستووری کۆماری تورکی بە رۆحێکی ناسیۆنالیستانە نـزم کرابوون. لە ئەنجامدا یەکەمین دەستوری کۆماری تورکیا لە رێیەکی یاساییەوە سیاسەتی کۆنەپەرستانەی دەسەڵاتدارانی تورکی لەبارەی کێشەو پرسی نەتەوایەتی جێگیرکرد، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە یاسا دەسەڵات بداتە دەست تورکەکان زۆر بە توندی جوڵانەوەی نەتەوەیی رزگاریخوازی کوردی سەرکوت بکات. باشترین نمونەش بۆ ئەمە شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران بوو کە (١٤) ویلایەتی لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی وڵاتدا گرتەوە، دەسەڵاتدارانی تورك لەگەڵ گورزی سەربازیدا ئەو یاسایانەشیان بەکاردەهێنا کە پێشتر باسمان لێوەکرد.

لـە(٢٥) شـوباتی(١٩٢٥) دا ئەنجومـەنی وەزیـران بڕیـاری ژمـارە (١٥٤٧) ی پەسەندکرد، بە گوێرەی ئەم بڕیارە باری نائاسایی لە هەرێمەکە راگەیەندرا. هـەمان رۆژ لە (١٥) ئـەپریلی (١٩٢٣) ئەنجومـەن بڕگـەی یەکـەمی یاسـای لـە بـارەی خیانـەتی نیشتمانییەوە دارشت و پەسەندی کـرد (٥٥٥). بـە پـێ ی ئـەم بڕگەیـە دروسـتکردنی رێکخراوی سیاسی لەسەر بنەمای ئاینی هەروەها بەکارهێنانی ئاین بۆ ئامانجی سیاسی قەدەغەکرا. هەر کەسێك ئەم جۆرە رێکخراوانە دروست بکات یان ببێتە ئەندام تیایدا بە خائین حسێب دەکرێت .

ئەگەرچی هۆکـاری راپـەڕینی( شـێخ سـعید ) بـە شـێوەیەکی سـەرەکی هۆکـاری ئابووری-کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی بوو، بەڵام حکومەتی (عیصمت پاشا) مەبەستی بوو پرسی کوردی تەنها بە سوپا و پۆلیس و سەرکوتکردن چارەسەر بکات. عصمت پاشا کە لە بەردەم ئەنجومەندا وتەیەکی دوور و درێژی پێشکەشکرد، وتی: پێش هەموو شتێك لە سیاسەتی ناوخۆماندا هـەوڵ دەدەیـن دوایـن رووداو لەناوبـەرین، وڵات لـە پیلانگێـڕی بپارێزین، ئارامی بۆ کۆمەڵ دابین بکەین و دەسـەڵاتی دەوڵـەت لـە هـەموو بوارەکانـدا بەهێز بکەین ئەمەش بە کردەوەی تایبەت دەکرێ کە ئێمە رامان وایە لە پەسـەندکردنی سوودمەند دەبین (٣٩ لا ٦٩).

بە گوێرەی ئەم بەرنامەیە حکومـەتی عیـصمەت پاشـا هـەنگاوی بـۆ لـەناوبردنی راپەڕینی شێخ سەعید نا. ئەو حکومەتە بە پەلـە کەوتـە گەڵاڵـەکردنی پـڕۆژە یاسـای پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ و خرایە بەردەم ئەنجومەن بەڵام ئۆپۆزسیۆنی ناو پەرلەمان لـە دژی وەستان چونکە ئاماژەیان بەوە دەکرد کە ئەم جۆرە کارانە پێـچەوانەی دەسـتوورە و یاسای واش هەیە کە بەشی ئەوە دەکات ئاسایشی وڵاتی پێ بپارێزێت. لە کاتی لێدوانی مەسەلەی پاراستنی ئاسایشی وڵاتدا ژمارەی ئەنـدامانی ئەنجومـەنی بـاڵای نەتـەوەیی تورکیا(٢٨٧) کەس بوون،(١٤٤) ئەندام بەشدارییان تێدا کرد و(١٢٢) کـەس دەنگیـان بۆدا،(٢٢) کەسیش دژ بوون،(١٤٣) ئەندام پەرلەمانیش بەشدارییان تێدا نەکرد. ئەمـە ئەوە دەگەیەنێت کە لەو قۆناغەدا ئۆپۆزسیۆنێکی بەرچاوی دژی حکومەت هـەبووە. بـۆ نموونە ئەگەر بهاتایە لە جیاتی(١٤٣، ١٤٤) کەس بەشداری نەکردبا لێدوانەکە دەربارەی

ئەم یاسایە دروست نەدەبوو. لێرەدا جێی ئاماژە پێ کردنە کە ئەو ژمارە زۆرەی ئۆپۆزسیۆن زیاتر لە نوێنەرانی کورد پێکهاتبوون (٢٧ لا١٩٢) لە چواری ئازاردا دوای مشت ومڕێکی زۆر توندوتیژی ناو پەرلەمان کە لە نێوان باڵی ناسیۆنالیستی و باڵی لیبراڵەکاندا بوو یاسای ژمارە (٥٧٨) لە بارەی ئاسایشی ناوخۆ پەسەندکرا، کە دەسەڵاتێکی ئێجگار زۆری دایە حکومەت بۆ سەرکوتکردن و لەناوبردنی هەر جۆرە دەنگێکی نارەزایی یان هەر جۆرە کردارێکی ئۆپۆزسیۆنانە. لە بڕگەی یەکەمی یاساکەدا هاتووە: لەبەر چەندین هۆکار، حکومەت دەسەڵاتی زۆری لە لایەن سەرۆك کۆمارەوە پێدراوە بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی هەر جۆرە دەنگێکی نارەزایی و چالاکی دژی حکومەت و سەرکوتکردنی هەر جۆرە چاپ و بڵاوکردنەوەیەك کە خەسڵەتی کۆنەپەرستانەی پێوە دیاربێ، بە تایبەت کە هانی خەڵکی بدات بۆ یاخی بوون و زیان لە بەرژەوەندی گشتی بدات و ببێتە مایەی نائارامی و تێکدانی ئاسایشی وڵات. حکومەت ماف و دەسەڵاتی هەیە هەر کەسێك بداتە دادگەی سەربەخۆیی ئەگەر هات و یەکێك لەو سەرپێچیانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن ئەنجام دابێ (٧ب، ٦لا١٤٤).

ئەگەرچی بەشێکی دیار لە ئەندامانی پەرلەمان ئۆپۆزسیۆن بوون لەگەڵ ئەوەشدا، ئەنجومەن بڕیاری پێکهێنانی دوو دادگەی سەربەخۆیی دا: یەکێك بۆ هەموو تورکیا کە ناوەندەکەی لە ئەنقەرە بوو دەسەڵاتەکانیشی دیاری کراو بوو، ئەگەر حوکمی لە سێدارەدانی یەکێکی بدایە پێویستی بە ڕەزامەندی ئەنجومەن دەکرد، دووەمیان لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی وڵات بوون لەگەڵ پێدانی دەسەڵاتێکی بێ سنوور، لە(٧) ی ئازاردا ئەنجومەن دادگەکانی سەربەخۆییان هەڵبژارد.

پەسەندکردنی ئەو جۆرە یاسایانە لە ناوەڕۆکدا بووە هۆی لەناوبردنی هەموو چالاکییەکانی ئۆپۆزسیۆن، ئازادیی بۆرژوازیی سنووردار دەکرد کە لە دەستووردا هاتبوو هەروەها ڕێخۆشکەر بوو بۆ بەرقەراربوونی سیستێمی دیکتاتۆریی تاکە حیزبی کەمالیستەکان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ.

٧ی ئازار بڕیاری حکومەت لە بارەی (تجنیدی عسکری جزئی) بە سەربازییکردنی خەڵك بە شێوەیەکی گشتی لە وڵات ڕاگەیەندرا. ڕۆژی دواتر مستەفا کەمال

بانگەوازێکی بۆ خەڵك و سوپا و کارمەندان بڵاوکردەوە و تیایدا ئاماژەی بەوە دابوو کە ڕاپەڕیوەکان لە ژێر چەتری داکۆکیکردن لە ئاین ئامانجیان دژە شۆڕشە. لە بانگەوازەکەیدا ئاماژەی دابوو کە: ئەنجومەن و حکومەت هەنگاوی پێویست دەنێن، خەڵك و سوپا ئۆرگانەکانی بەڕێوەبردن ، پۆلیس و ژاندارم پێویستە هەست بەو ئەرکە بکەن و یارمەتی حکومەت بدەن لە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی لە بارەی لەناوبردن و تەفروتوناکردنی ڕاپەڕینەکە بۆیان دێت (٣٩ لا٩٢) .

(١٢) ی ئازاری (١٩٢٥) دادگەی سەربەخۆیی ئەنقەرە بەیاننامەیەکی بۆ خەڵکی بڵاوکردەوە کە تیایدا هەڕەشەکانی بەمجۆرە ڕادەگەیەنێ: زۆر بە توندی سزای ئەو کەسانە دەدەین کە ڕای گشتیی کۆمەڵ دژی ئەم سیستێمە هان بدات و پشتگیری لە حەماسەتی ڕاپەڕیوان بکات، هەروەها ئەوانە کە خۆ لە خزمەتی سەربازی بدزنەوە و هانی خەڵکی بدەن بۆ ڕاکردن یان یارمەتی ڕاپەڕیوان بدەن (١٣ لا١٠٨) .

دوای چەند ڕۆژێك پارتی گەلی کۆماری (پ گ ك) پێشنیازی حکومەتی لە بارەی حوکمی گوللەبارانکردن لە مەیدانی شەڕدا پەسەندکرد کە لە لایەن سەرکردە سەربازییەکانەوە دەدرێن لە ناوچە ڕاپەڕیوەکاندا، ئەمە تەنها لە لایەن سەرکردەی ئەو ناوچەیەوە پێشوازی لێکراو پەسەندکرا، دواتر ئەم کێشەیە کە لە ناو پەرلەماندا باسی لێوەکرا هەرایەکی زۆری لە لایەن ئۆپۆزسیۆنەکانەوە نایەوە.

بەڵام پرۆژە یاسای ژمارە(٦٨٩)کە لە لایەن حکومەتەوە پێشنیازکرابوو ئەوا لە (٣) ی ئازاردا لە لایەن ئەنجومەنەوە بێ گۆڕانکاری پەسەندکرا. ئەم یاسایە تا پەیدابوونی یاسای نائاسایی ژمارە(٣٨٣٢) لە (٢٢) ی ئایاری ساڵی(١٩٤٠)کاری پێدەکرا.

بۆ کۆتایی مانگی ئازار هێزەکانی حکومەت ئامادەیی تەواویان هەبوو دەست بە پەلامار و هێرشبردن بکەن بۆ سەر ئەو ناوچانەی شۆڕشی تیا هەڵگیرسا بوو. سەرکردەی سوپای تورك، ژانراڵ کەمالەدین سامی پاشا، ڕای گەیاندبوو کە سێ ئەرك لە بەردەم حکومەت دایە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد :

١. جەنگێکی خوێناوی بێ رەحمانە بۆ سەرکوتکردنی شۆڕش، بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش رۆژانی یەکەمی مانگی ئەپریلی(١٩٢٥) ی دەست نیشان کردبوو بۆ دەستپێکردنی هێرش و پەلامار.

٢. چەککردنی هەموو کوردەکان، بێ رەچاوکردنی ئەوەی کێ بەشداری لە شۆڕش کردووە یان نەیکردووە.

٣. کۆچ پێ کردنی کوردەکان بۆ ناوچە جیاجیاکانی وڵات، بۆ ئەوەی ئەوان لە هیچ شوێنێ زۆرینە نەبن و ناردنی خەڵکی تورك بۆ ناوچە کوردییەکان. (٤ لا٩٢) .

ئەگەرچی راپەڕینەکە لە ناوەرۆکدا سەرکوت کرا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتدارانی تورك بەردەوام بوون لە دەرکردنی بڕیار و کۆمەڵێك یاسای سەختکەزۆر بێ ویژدانانە بۆ تەمبێکردنی بەشداربووانی راپەڕینەکە بەکاریان دەهێنا، بە تایبەت دژی خەڵکی مەدەنی و هەموو جۆرە جوڵانەوەیەکی ئۆپۆزسیۆن. بەم شێوەیە پەرلەمانی تورکیا لە (٢٠) ئەپریلی(١٩٢٥) دا بۆ حەوت مانگی تر لە ناوچەی راپەڕین و دەوروبەری ئابڵوقەدانی باری نائاسایی درێژ کردەوە.

لە هەمان کاتدا دەسەڵاتیان بە حکومەت دا هەر گۆڕانکاریەك بکەن پەیوەندی بە پێکهاتنی ئیداریِ ناوچەکەوە هەبێت. ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا کارو چالاکی دادگەکانی سەربەخۆیی بۆ شەش مانگی تر درێژ کردەوە، هەروەها دەسەڵاتی بە دادگەی سەربەخۆیی ئەنقەرەدا لە کاتی جێبەجێکردنی حوکمی مەرگدا پێویست بە پەسەندکردنی ئەنجومەن ناکات .

ناوەڕاستی مانگی ئەپریلی/ نیسان/(١٩٢٥) بوو، دادگەی سەربەخۆی (دیاربەکر) بانگەوازێکی بۆ خەڵکی بڵاوکردەوە و تیایدا هاتبوو: دەسەڵاتەکانی دادگەی سەربەخۆی لە ویلایەتەکانی ئەرگان، ئەلیازیس، دیاربەکر، ئورفە، بتلیس، هەکاری، دەرسیم، سێڤیریك، ماردین، مالاتیا، موش گینج، وان، هینیس و ئەرزرۆم جێبەجێ دەکرێن و دادگە ماف و دەسەڵاتی پێدراوە کە یاسا هەرە توندوتیژە کۆمارییەکان لەو ناوچانەدا بسەپێنێ و جێبەجێیان بکات. (٥٩، ١٤، ٥، ١٩٢٥) .

(٢٢) ئەپریلی (١٩٢٥) پەرلەمان یاسای ژمارە(٢٣٥) ی لە بارەی گۆڕانكاری لە یاسای تاواندا پەسەندكرد. بە گوێرەی ئەم یاسایە حوكمی مەرگ بەسەر هەر كەسێكدا دەسەپێندرا ئەگەر هەوڵی بدایە گۆڕان بەسەر دەستووری كۆماریدا بێنێت و پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە یان ڕێگریێت لە بەردەم كارەكانیدا، هەروەها خەڵك هان بدات دژی حكومەت لە ڕێی چەكهەڵگرتن و بەشداریكردن لە ڕاپەڕین و دژایەتیكردنی میللەتی توركیادا. هەر بۆ ئەم مەبەستە لە ئایاری(١٩٢٥) دا كۆمسیۆنێك لە وەزارەتی ناوخۆ پێكهات بۆ ئەوەی سانسۆر بخەنە سەر هەموو هەواڵنێرانی ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵات. بە گوێرەی ئەم بارودۆخە سندوقی پۆست دەبوایە لە بەردەم جاسوسەكانی سانسۆردا بكرێتەوە. هەر كارمەندێك تاوانبار بكرابا لە بارەی بڵاوكردنەوەی دەنگوباس ئەوا بێ ئەوەی بە سانسۆردا تێ پەڕیبا ئاراستەی دادگە دەكرا. لەمەش بترازێ هەموو جۆرە تێلێگرافێك دەبوایە بە زمانی توركی بنێردرێت، ڕۆژنامە و بڵاوكراوەكانیش كەوتبونە بەر لێشاوی سانسۆرەوە (٥٧، ٢٤، ٥، ١٩٢٥) .

لە حوزەیرانی(١٩٢٥) دا حكومەتی توركیا بڕیاری دەستبەسەراگرتن و جەردكردنی مڵك و ماڵی ئەو خەڵكانەی دابوو كە لە دێهاتەكان و شارەكاندا ڕاگواسترابوون لە ئەنجامی هێرشی تەمبێكردندا بەر ئەو حەملەیە كەوتبوون، لە هەمان كاتدا مڵك و ماڵی ئەوانەی بەشدارییان لە ڕاپەڕینەكەدا كردبوو دوای دەست بەسەراگرتنی لە لایەن حكومەتەوە لە بازاڕدا هەراج دەكرا. (٥٧، ٢١، ٦، ١٩٢٥) .

لە (٢١) نۆڤەمبەری (١٩٢٥) دا ئەنجومەن پشتگیری لە پێشنیازی حكومەت كرد كە بۆ ماوەی ساڵێكی تر لە ناوچەكانی شۆڕشی شێخ سەعیددا ئابڵوقە درێژ بكرێتەوە.

لە(٣١) ی ئایاری (١٩٢٥) دا ئەنجومەن یاسای ژمارە(٨٨٥) ی لە بارەی ڕاگواستن یان نیشتەجێكردن پەسەندكرد. ئەم یاسایە دەسەڵاتی بە ئەنجومەنی وەزیراندا هەندێ لە كۆچەران لەو ناوچانەی دانیشتوانیان كەمە نیشتەجێ بكات، ئەم جۆرە نیشتەجێكردنە لەبەر هۆكاری نەبوونی پێداویستی ژیان بوو، هەروەها ئەو كەسانەشی دەگرتەوە كە لەسەر سنوورەكان دەژیان و گومانی جاسوسیان لێ دەكرا.

حکومەت کاتێك هەستی دەکرد بارودۆخەکەی لـە کوردسـتان لاوازە ئیـدی لەگـەڵ هێرش و پەلاماری تەمبێ کردندا پەنای بۆ چالاکییە ئیدارییەکان دەبرد کە پێـی وابـوو بەو جۆرە رۆح و هەستی جوڵانەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد تێکدەشکێنێ .

لـە(١٠) ئایـاری(١٩٢٥) دا ئەنجومـەن یاسـای ژمـارە(١٠٩٧) پەسـەندکرد. بـە پشتبەستن بەو یاسایە دەست کرا بە راگواستنی کورد لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتەوە بەرەو ویلایەتەکانی رۆژئاوا (٣٥، لا،٢٨-٣٠).

ئەم یاسایە ئامـاژەی بـەوە کردبـوو کـە لەبـەر هۆکـاری ئیـداری و عەسـکەری و کۆمەڵایەتی ڕێگە درابوو کە خەڵکی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات کـە ئابلۆقـە درابـوون و ویلایەتی بایەزید بۆ ویلایەتەکانی رۆژئاوا رابگوێزرێن . نزیکەی (١٤٠٠) کەس بە ماڵ و منداڵ و خێزانەوە راگوێزران، هەروەها ئەگەر خێزانـی کـوردی وا لەبەرچـاوبگرین کـە منداڵیان زۆرە و نەوە بە دوای نەوە زیاد دەکەن، ئەوا ئەوانەی دووچاری راگواسـتن هـاتن گەلێ لەوە زیاتر بوون.

مادەی دووەمی یاسای راگواستن ئاماژە بەوە دەدات کە تا مـانگی ئـابی (١٩٢٧) دەبێ پرۆسەکە تەواو ببێت. ئەو خێزانانەی کە پارچە زەویـان هـەبوو بۆیـان هـەبوو تـا نۆڤەمبەری بێننەوە (١٩٢٧). ئەمـە دەری دەخـات کـە راگواسـتنەکە بـە پەلـە ئـەو کۆچەرانە دەگرێتەوە کە زیاتر روحی جەنگاوەری و بەرهەڵستییان تێدا بوو. بـە گـوێرەی مادەی (٣ ) ی (لیڤەوماوان) (محتاجەکان) دەبوایە بە خێرایی بیانگوێزنەوە کەچی لە زۆر شوێندا پارەی گواستنەوەکەشیان لێ دەستاندن، بە تایبەت هەموو ئەو کوردانەی کە بـۆ ویلایەتەکانی رۆژئاوا گواسترانەوە لەسەر حیسابی خۆیان بوون.

بە گوێرەی مادەی (٥) کوردەکان دەبوایە لە ویلایەتەکانی رۆژئـاوا لـەو شـوێنانەدا نیشتەجێ بن کە حکومەت بۆیانی دیاری کردبوو، هەموو ئەو کوردانـەی کـە مـەحکوم کرابوون بۆ ئەو ناوچانە رەوانە کران، بەڵام ئەنجومـەنی وەزیـران دەرفـەتی ئـەوەیان پـێ نەدەدان لەگەڵ ماڵ و خێزانیان تێکەولاو بن. بـەڵام دواتـر ئـازادکران لـەوەی بـە هـەر لایەکدا سەفەر بکەن و بگەڕێن تەنها ویلایەتەکانی رۆژهەڵات نەبێ.

ئەمەیە ناوەرۆكی یاسایی ژ (١٠٩٧) كە لە ئەنجامدا هەزاران كورد ملك و ماڵی خۆیان لە دەستدا و راگوێزرانە ویلایەتەكانی رۆژئاوا.

میدیای توركی بە حەماسەتەوە باسی ئەو یاسایانەی دەكرد، رۆژنامەی (حاكمیەتی میللی) لە (١٩) ی حوزەیرانی (١٩٢٧) دا نووسیبوی: حكومەت كە ئەم یاسایەی پەسەند كرد ئەركێكی مرۆڤانەی جێبەجێ كردووە بەوەی كە بەشێكی زۆری دانیشتوانی ویلایەتەكانی رۆژهەڵاتی لە دەست شێخ و زاڵم رزگاركرد.

لە ئەنجامی ئەو جۆرە رزگاركردنەدا بە قسەی ڤاسیلی نیكیتین لە نێوان ساڵانی (١٩٢٦-١٩٢٧) دا دەسەڵاتدارانی توركیا نزیكەی یەك ملیۆن پیاو منداڵ و ژنی كوردیان ئاوارەی رۆژئاوای ئەنادۆڵ كرد، لە هەمان كاتدا بێ بەزەییانە خەڵكیان ئازار دەدا، هەروەك لە سەردەمی جەنگی جیهانیی یەكەمدا كاتی راگواستنی ئەرمەنییەكان سیاسەتی تیرۆر و ئابلۆقەدان لە ویلایەتەكانی رۆژهەڵاتدا، بە درێژایی ساڵانی حوكمی كەمالیستەكان درێژەی هەبوو، كە ئەمەش بووە هۆی توندوتیژبوونی تەواوی بارودۆخی سیاسیی وڵات و دەنگی نارەزایی لەناو توێژی جیاجیای كۆمەڵی توركیادا بەرزبۆوە.

لەبەرئەوە هاوینی (١٩٢٧) حكومەتی پارتی گەلی- كۆماری بڕیاریدا میتۆدو شێوازێكی تری حكومڕانی لە ویلایەتەكانی رۆژهەڵات بگرێتە بەر. هەر بەم بۆنەیەوە لە (٣٠) ی نۆڤەمبەری (١٩٢٧) دا لە ئەنقەرە فراكسیۆنی پارتی گەلی كۆماری ناو پەرلەمان كۆبوونەوەیەكیان كرد، (عصمت پاشا) كە ئەو دەمە سەرۆك وەزیران بوو لە كۆبوونەوەكەدا وتی: بە پێویستی دەزانم كۆتایی بەو بارودۆخە نائاساییەی دەسەڵاتی بێ وێنە بێنن لە ویلایەتەكانی رۆژهەڵاتدا و قۆناغێكی نوێ دەست پێبكەین كە ریفۆرمی ئاشتی بێت.

سەرۆكی حكومەت پێشنیازی ئەوەی كرد چیدیكە ئابلۆقەی ناوچەكانی رۆژهەڵات درێژ نەكرێتەوە كە لە نۆڤەمبەری (١٩٢٧) دا كاتەكەی تەواو دەبوو، بەڵكو ئەو ناوچانە بخرێنە ژێر چاودێری گشتییەوە. جگە لەمە پێشنیازی بۆ ئەنجومەن كرد كە ئەو كەسانەش لە دەست راگواستن رزگار بكرێن و دەرفەت بۆ ئەوانەی رۆژئاواش بڕەخسێنن بگەڕێنەوە بۆ ناوچەكانی خۆیان، بە تایبەت ئەوانەی كە ساغ بوونەتەوە دڵسۆزی

حکومەتن و هیچ شتێکیان لەسەر نییە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا عصمت پاشا داوای پشتگیریکردنی یاسایەکی دەکرد کە ژاندارم لە کوردستاندا بەهێز بکرێت.ئەم پێشنیازانە لە لایەن گروپەکەی پەرلەمانەوە پشتگیری کران (٦٢، ١، ١٢، ١٩٢٧).

لە ئەنجامدا و لە (٢٥) ی حوزەیرانی (١٩٢٧) دا پەرلەمانی تورکیا ئەنجومەن یاسای ژمارە (١١٦٤) ی پەسەندکرد و دەسەڵاتی بە ئەنجومەنی وەزیران دا بە گوێرەی پێویست چاودێری مەدەنی دروست بکات کە هەریەك لەو گروپانە سەر بە ویلایەتێك بن و زانیاری بۆ یەك ناوچەی بەڕێوەبردن کۆبکەنەوە (٦،لا،٦٨) یاسای ژمارە (١١٦٧) راستەوخۆ دژی کورد ئاراستەکرابوو کە زۆرینەی ئەو ویلایەتانە بوون. لە (٢٧) ی نۆڤەمبەری هەمان ساڵدا حکومەتی تورکیا ڕێنماییەکی تری دەرکرد، ئەویش دەستنیشان کردنی ئەرکەکانی چاودێریکردنی گشتی بوو. بە پێی ئەم ڕێنماییە ویلایەتەکانی ئیلیازیس، ئورفە، بیتلیس، هەکاری، دیاربەکر، سیرت، ماردین و وان خرانە چوارچێوەی هەرێمێکی ئیداری تایبەت کە دواتر نازناوی چاودێری گشتی یەکەمی بەسەردا برا.

لێرەدا چاوێك بە گرینگترین دۆخی ڕێنماییەکاندا دەخشێنن لە بارەی (چاودێریکردنی گشتی) یەوە کە بە رای حکومەتی تورکیا ئەمانە دەبنە هۆی ئاساییکردنەوەی ژیان بە گشتی لە کوردستاندا، گرنگی ئەم ڕێنماییانە لە بڕگەکانی(٧-١٣) دا دەردەکەون لە بارەی دەسەڵاتەکانی چاودێری گشتی (٦لا ٤٥٠) . ئەو بڕگانەش کە پەیوەندییان بە ڕێنماییەکانەوە بوو ئەمانەن :

٧. چاودێریکردنی گشتی لە ناوچە قانونییەکانی خۆیاندا جێگەی باوەڕی نوێنەرانی حکومەتن بە گشتی و هەندێ وەزارەتەکان بە تایبەتی، تەواوی کارمەندانی دەوڵەتیان لە ژێر دەستدایە، لەوانە پارێزگاران کە لەبەردەم چاودێری گشتیدا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ.

٨. پارێزگاران و کارمەندانی تری دەوڵەت، وەك پێشتر ملکەچی جێبەجێکردنی یاسا و پشتیوانی لێکردنی دەبن لەگەڵ وەزارەتەکانیانداو.. لە کاتی پێویستدا دەبێ لە

بەردەمی چاودێری گشتیدا هۆکاری هەڵسوکەوتی خۆیان روون بکەنەوە، و هەموو دۆکومێنتێکی پێویست بخرێتە بەردەستیان .

چاودێرییکردنی گشتی، ئۆرگانێکی تێکەڵاو دروست دەکات کە پارێزگار و کارمەندە گەورەکانی تر بۆ هەر کارێك دەبێ رووبکەنە ئەم ئۆرگانە، چونکە بە سەرچاوەی کارەکان حسێب دەکرێ. چاودێری گشتی، ئاماژە بەو ئۆرگانە، دەستنیشانی رێگەچارەی گرنگترین کێشەکان دەدات.

٩. لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆیدا چاودێرییکردنی گشتی دەتوانێ روو لە وەزارەتی ناوخۆ بکات و بازنەی دەسەڵاتەکانی خۆی لە ویلایەتەکە فراوانتر بکات و ئەو ناوچانەش بگرێتەوە کە لە دەرەوەی توانای ئەون. چاودێری گشتی بۆ ئەوەی دەسەڵاتی هێز و سوپاشی هەبێ روودەکاتە بەرزترین پایەداری لەشکر لە ویلایەتەکەی، ئەو سەرکردایەتیی سوپا دەکات داوای لێدەکات لە کاتێکدا کە بە ئاشکرا باس لە بۆچوونەکانی خۆی دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەی دیاری کراودا.

١٠. لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیدا چاودێری گشتی تەنها لە بەرامبەر حکومەتی ناوەندیدا بەرپرسیارە. بە گوێرەی مادەی سێیەمی قانوون لە بارەی چاودێری گشتی، ئەوا بەڕێوەبەر یان بەرپرسی چاودێری گشتی ئەم دەسەڵاتانەی هەیە:

a. چاودێرییکردنی ئارامی و ئەمنی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی.

b . زۆر بە ووردی کۆنترۆڵکردنی جێبەجێکردنی یاسا و رێنماییەکان دەکات.

c. بۆ جێبەجێکردنی یاسا توند و تیژەکان راستەوخۆ پەیوەندی بە وەزارەتی دادەوە دەکات و داوای وەرگرتنی روونکردنەوە لە دادوەری گشتی دەکات، ئەوجا وەزیر لە چۆنیەتی جێبەجێکردنی یاساکان و پرۆسەکان ئاگادار دەکاتەوە.

d. هەنگاوی پێویست بنرێت بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و گەشەکردنی کولتووریی ئەو ناوچانەی بەو سپێردراوە لە رێگەی لێکۆڵینەوەیەکی تەواوی پێداویستیەکانی خەڵك، هەروەها بە دواداچوونی ووردو مەنتیقی ئەو هەنگاوانەی کە بۆ ئەم مەبەستە دەنرێت لەگەڵ کۆنترۆڵکردنیدا .

e. دابینكردنی مافی تاكەكەس و مافی مولكایەتیی خەلكی ئەو ناوچەیەی كە لە ژێر بەڕێوەبردنی ئەودان.

f. هەنگاونان بۆ باشتركردنی ژیانی خەلك، گۆڕاندنی ژیانی كۆچەرایەتی بـۆ ژیـانی نیشتەجێبوون، دابەشكردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا .

j. وەك پسپۆڕێكی ئیداری پایەبەرز و وەك بەرپرسی یەكەمی ناوچەكە بـۆی هەیـە پارێزگار و كارمەندانی تری دەولەت دەربكات ئەگەر پێی وابوو كە ئەمانە بێ كـەلكن و سوودیان نییە لە دابینكردنی ئارامی و ئاسایش لەو هەرێمەی كە ئەو تیایدا بەرپرسیارە.

٣. رێكخستنی كارەكانی گشت چاودێرەكان (مفتش) و رێكخستنی رۆشنگەری .

بەرپرسی گشتی چاودێری لەسەر ئاستی ناوخۆی ولات كاردەكات و بە هـیچ جـۆرێ پەیوەندی بەو كاروبارانەوە نیە كە كارمەندانی تر لە پرسێكی دیاریكراودا پەیوەندی بـە دەرەوەی ولات دەكەن.

١٢. ئەگەر هات و چاودێری گشتی ئەوەی ساغ كردەوە كە لـە هەرێمەكـەی ئـەودا دۆخێك دروست بووە هەڕەشە لە ئـارامی و ئاسـایش دەكـات، ئـەوا بـۆی هەیـە داوای وەرگرتنی فەرمان لە وەزارەتی ناوخۆ بكات و حالەتی جەنگ رابگەیەنێ لـەو هەرێمـەی كە خۆی تێدا بالا دەستە.

١٣. بەرپرسی چاودێری گشتی كە بەرزترین دەسەلاتی هەیە و مافی جێبەجێكردن و بەڕێوەبردنی چاودێریی گـشتیی هەیـە، بـۆی هەیـە كـۆنترۆلی تـەواوی دەسـەلاتەكانی هەرێمەكە بكات، هەر بەو ئەندازەیەش دەتوانێ رەوایەتی تەواو بداتە بڕیارەكان و

پڕۆژەكانی پارێزگار و ئەنجومەنی شارەوانی، یان رەتیان بكاتەوە. بەرپرسی چاودێریی گشتی دەتوانێ پڕۆژەكانی بودجە و هەر شتێكی لەو بابەتە بۆ ویلایەتـەكانی بنێرێتـەوە ئەگەر هاتوو پێی باش نەبوو یان كەموكوڕییان تێدا بوو یـاخود لەگـەل یاسـادا نـاكۆك بوون.

١٤. بەرپرسی چاودێریی گشتی لە كاتی پێویستدا دەتوانێ لـە نێـو ویلایەتەكانـدا دامەزراوێك دروست بكـات و بودجەكـەی، لـە ناوەڕۆكـدا لـە رێگـەی پارێزگارەكـان و ئەنجومەنی گشتیی شارەكانەوە بۆ تەرخان دەكرێت .

١٥. هەموو سێ مانگ جارێ چاودێریی گشتی لە بارەی دابینکردنی ئارامی و ئاسایش لەو ویلایەتانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئەودان راپۆرتی خۆی پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ دەکات و رای خۆی لە بارەی دۆخی گشتیی هەرێمەکە دەنووسێ. وێنە یان کۆپی ئەم راپۆرتە لە لایەن بەرپرسی چاودێریی گشتییەوە بۆ چەند وەزارەتێکی تر کە پەیوەندیدارن بەم بەرپرسەوە دەنێردرێن.

١٦.وەزیری ناوخۆ خۆی کۆنترۆڵی کار و کردەوەکانی چاودێریی گشتی دەکات.

١٧. یەکەم راوێژکاری گشتی دەبێتە یاریدەدەری بەرپرسی چاودێریی گشتی بە فەرمانی ئەو دەستبەکار دەبێت و نوسراوەکان ئیمزا دەکات. (٧ب٩،لا٢٠- ٢٣).

لە لێکدانەوەی ناوەرۆکی ئەم بڕیارانەدا وامان بۆ دەردەکەوێ کە بەرپرسی چاودێریی گشتی ماف و دەسەڵاتێکی بێ سنووری لە کوردستانی تورکیا پێ دراوە. بیرۆکەی تەواوی سیستێمی چاودێری گشتی هەروەك رۆژنامەنووس و کەسایەتیی کۆمەڵایەتی یونس نادی لە وتارێکدا نووسیبووی: لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا (جومهوریەت ١٢ کانونی یەکەمی ١٩٢٧) بریتییە لە چڕکردنەوە و کۆکردنەوەی دەسەڵاتی بەڕێوەبردن لە دەستی بەرپرسی چاودێری گشتیدا .

بۆ سەرکوتکردنی هەر جۆرە دەنگێکی نارەزایی دژە حکومەت لە لایەن جوڵانەوەی کوردییەوە، حکومەتی تورکیا لە کانونی دووەمی (١٩٢٨) دا بڕیارێکی لە بارەی دروستکردنی هێزی ژاندارمی مۆدێرنەوە دەرکرد. بەشێك لەم هێزانە خرانە ژێر دەستی وەزارەتی ناوخۆ، لە راستیدا بە کردەوە خرانە ژێر دەسەڵاتی بەرپرسی چاودێریی گشتی کە ئەویش دەبوایە بە پێی ویستی خۆی بەکاریان بێنێ.

لە بارودۆخێکدا کە جوڵانەوەی کوردی لە ناوچەکانی ئارارات روو لە گەشەکردن و بەهێزی بوو، حکومەتی تورکیا هەوڵی دەدا پیاوماقوڵان و نەجیبزادەکان بە لای خۆیدا رابکێشێ، بۆ ئەم مەبەستەش دەستیان کرد بە گەڕاندنەوەی بەشێك لەو فیۆداڵ و دەرەبەگانە بۆ کوردستان (کە پێشتر بۆ رۆژئاوای ئەنادۆڵ راگوێزرابوون /وەرگێڕ).

لە سەرەتای مانگی ئازاری (١٩٢٨) دا (ئیبراهیم تالی- بێگ) کە بەرپرسی چاودێری گشتی بوو هەموو پارێزگارانی ویلایەتەکانی سەر بە حاکمیەتی خۆی لە

دیاریەکر داوەت کرد، تا سیستمێك و ڕێوشوێنێك بگرنەبەر لە بارەی گەشەپێدانی پیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانی لە هەرێمی بەرپرسی یەکەمی چاودێریی گشتیدا.

ئەم کۆبوونەوەیە سێ هەفتەی خایاند، تا کۆتایی مانگی ئازار بەردەوام بوو، لە دۆکۆمێنت وبەیاننامەکانی ئەو کۆبوونەوەیەدا چەند بڕیارێك بەدی دەکران کە پەیوەندییان بە بوارەکانی ئابووری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا هەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا وا دەردەکەوێ کە ئیبراهیم تالی- بەگ پەرۆشی خۆی بۆ دانیشتوانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات نیشان داوە . لە ناوەراستی نیسانی (١٩٢٨) دا لە یەکێك لە راگەیاندنەکانیدا رەخنەی لە بێسەرویەری دەسەڵاتدارانی ناوچەکەدا گرت کە پێداویستی خەڵکیان بە لاوە گرنگ نیە، بەڵام ئەمە تەنها بریتیبوو لە مەبەست و نیازێکی خێر کە کەس ئامادە نەبوو لە واقیعدا جێبەجێی بکات. ئەو کاتەی کە حکومەتی تورکیا هەوڵی دەدا پیاو ماقوڵانی کورد بە لای خۆیدا راکێشێ، چەندین هەنگاو وکاروکرداری بۆ گەڕاندنەوەی هەندێ لە دەربەگە کوردەکان بۆ کوردستان گرتەبەر. لە وتووێژێکدا لەگەڵ یەکێك لە رۆژنامەنووسەکاندا( عیسمەت پاشا) لە ئازاری (١٩٢٨) دا وتی: هەرچەندە لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا ئارامی و ئاسایش بەرقەرار بووە، لەبەرئەوە توانای ئەوە هەیە زۆر لەو کەسانە بگەڕێنینەوە کە پێشتر لە سەردەمی شۆڕشی شێخ سەعیددا دوورخرابوونەوە.

لە (٧) ی ئازاری (١٩٢٨) دا ئەنجومەن یاسای ژمارە (١٢٣٩) ی لە بارەی لێبوردنی گشتییەوە دەرکرد، کە بە گوێرەی ئەم یاسایە هەموو ئەو کەسانەی پێشتر بە هۆی بەشداریکردن لە شۆڕشی( شێخ سەعید) دا تاوانبار کرابوون لە سزادان ئازادکران. لە یاساکەدا هاتووە: ئەو کردەوانەی کە لە کاتی شۆڕشەکە تادەگاتە دۆخی ئابلۆقەدانی ناوچەکانی راپەڕین (٢٣، ١٩٢٧، ١١) ئەنجام دراون چیتر بە تاوان حسێب ناکرێن. (مادەی I) .

ئەو کەسانەی لە شۆڕشی (شێخ سەعید) دا تێوەگلاون و حکومەت بە دوایاندا دەگەڕێ، پێویستە لە ماوەی سێ مانگدا خۆ ئاشکرا بکەن بکەونە ژێر کاریگەری ئەم یاسایەوە (٧ب٩،لا ٨٠٤-٨٠٥)

لە (١٢) ی ئایاری (١٩٢٨) دا ئەنجومەن بڕیاری دا وەك ئیزافە بۆ یاسای پێشوو، کە لە (٧) ی ئایاردا دەرچوو بوو، چیتر ئەو کەسانە راونەندرێن کە تا (٣٠) نیسانی (١٩٢٨) گلەیی لە رەفتاریان هەیە، تەنها ئەوە نەبێ گەر تاوانبار کرابن بەوەی کە تاوانیان دژی دەسەلات کردبێ، دواتر ئەو سێ مانگە درێژکرایەوە بۆ (٦) مانگی تر (٧ب٩، لا، ٨٣٤) .

بەلام تورکیا مەبەستی بوو لەم کارانەیدا ئەنجامێکی باشی دەست بکەوێت، بەلام واش دەرنەچوو.

حکومەتی تورکیا لە گرتنەبەری سیاسەتی ئاشتیانەدا دەیویست ئاسانکاری بۆ ویلایەتەکانی رۆژهەلات نیشان بدات. بۆ نمونە لە ئازاری (١٩٢٩) دا لەگەڵ تەواوبوونی کاتی یاسا لە بارەی پاراستنی ئارامی، (عیسمەت پاشا) وتارێکی فراوانی دا بە تایبەتی لەوێدا وتی: ‹‹حکومەت پێویستی بە درێژکردنەوەی ئەم یاسایە نیە، دەتوانین بلێین لە دوو سالی رابردوودا حکومەت یاسای پاراستنی ئاسایشی بەکار نەهێناوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هاونیشتمانانی ئێمە بۆ دۆخێکی ئاسایی لە ولات هەوڵ دەدەن›› . دواتر سەرۆك وەزیران ئاماژەی بەوەدا کە: ئەرکی ئێمە ئاگادارکردنەوەی هاوولاتیانە لە بارەی ئەو پلانانەی کە لە دەرەوە بۆمان دێن، یاساکانی کۆماری ئەوەندە هێزیان هەیە توانای داکۆکیکردنیان هەبێ لە شەرەف و کەرامەتی ولات و کوڕەکانی لە هەر جۆرە دەسیسە و پیلانێکی دوژمنان هەرچەند زیرەکانەش دانرابن. (٥٩ ، ٤، ٣، ١٩٢٩)، بەلام حکومەتی ئەنقەرە بەو راگەیاندنانەیان هەوڵیان دەدا هیوایەك بە واقیعەکە بدەن، چونکە جولانەوەی کوردی لە ناوچەی ئارارات دژی حکومەتی تورکیا پێگەیشتبوو.

لەم بارودۆخەدا دەسەلاتداران لە تەك کردەوە عەسکەرییەکانیاندا چەند هەنگاوێکی تریان نا کە بە رای ئەوان دەبێتە هۆی خاوکردنەوەی گرژیەکان لە رۆژهەلاتی ئەنادۆلدا. هێشتا بەهاری (١٩٢٧) بوو حکومەتی تورکیا پرۆژە یاسایەکی لە بارەی دابەشکردنی

زەوی ئاغا و دەرەبەگەکان بەسەر جوتیارانی هەژار و بێ زەویدا ئامادەکرد، بە تایبەت زەوی ئەو ئاغایانەی کە بۆ رۆژئاوای ولات دوور خرابوونەوە. پرۆژە یاساکە قەوارەی زەوییەکانی دیاری کردبوو کە ٢٠٠دۆنم بوو، دەبوایە لە دەرەبەگ وەربگیرێ، نرخی ئەم پارچە زەوییە دەبوایە لە ماوەی بیست سالدا بدرێتە ئاغا. بەلام ئەم پرۆژە یاسایە پەسەند نەکرا. تەنها بە تێپەڕبوونی دوو سال ئەویش لە دووی حزیرانی (١٩٢٩) ئەنجومەن یاسای ژمارە (١٥٠٥) ی پەسەندکرد سەبارەت بەو زەوییانەی کە لە پارێزگاکانی رۆژهەلاتدا بەسەر جوتیاران دابەش دەکرێن و لە یاساکەدا هاتووە:

مادەی یەکەم: ئەو زەوییانەی بە حوکمی مادەی (٩) ی یاسای ژمارە (١٠٩٧) کە لە (١٩) ی حزیرانی (١٩٢٧) دەرچووە، پێویستە بدرێتەوە خەزنە و بەسەر دانیشتوانی دێهاتەکان کە لە هۆزە کۆچەرەکانن دابەشبکرێن و دەبنە مولکی ئەوان.

مادەی دووەم: حکومەت دەسەلاتی پێدراوە ئەو زەویانە بەسەر ئەو کەسانەدا دابەش بکات کە لە مادەی یەکەمی ئەم یاسایەدا ناویان هاتووە بەو قەوارەیەی کە ئەوان بە پێویستی دەزانن لە ناوچەکە و هەرێمەکەدا کە لە مادەی یەکەمی ژمارە (١٠٩٧) ی ویلایەتی ئورفە و بایەزیددا دەستنیشان کراوە.

مادەی سێیەم: نرخی ئەو زەویانەی کە بۆ دابەشکردن ئامادەکراون بە گوێرەی نرخی ناوچەیی دەستنیشان دەکرێ کە لە لایەن ئەنجومەنی قەزا و ئەنجومەنی ویلایەتەکانەوە دیاری دەکرێت. دادوەری گشتی بەشداری لە کاروچالاکی ئەو ئەنجومەنانەدا دەکات کە پەیوەندیان بەم پرسەوە هەیە، نرخەکان نابێ هەشت جار لە خۆی زیاتر بێت و دووجاریش لە قەوارەی خۆی کەمتر بێت.

زەوی مەتروکەش لە لایەن حکومەتەوە (کاداستر) دەستنیشان دەکرێت (٧، ب، ١٠، لا، ١٧٩٣).

بە گوێرەی ئەم یاسایە و بە ژمارەی رەسمی (٧٠) هەزار دۆنم دابەش کرابوون. لە راستیدا حکومەتی تورکیا ئەو زەویانەی جسێب کردبوو کە ئەو هۆزانەی پێشتر کۆچەر بوون و ئێستە گوندنیشینن و زەویەکانییان کردووە بە مولکی خۆیان، ئەو هۆزانە ناچارکرابوون کە پارەی ئەو زەوییانە بژمێرن، لەوەش گرنگتر دەسەلاتدارانی تورک

هەوڵیان دەدا دوویەرەکی بخەنە نـاو جوڵانـەوەی کـوردی بـەوەی عەشـیرەتی شـەڕکەر و کەللەڕەقی سەر بە ئاژاوە نیشتەجێ بکەن و گومرگی زۆریش بخەنە ئەستۆی کوردی تر.

ئەم جۆرە ریفۆرمانەی کـە لـە سـەرەوە ئـەنجام دەدران گـۆڕانی بەسـەر پێکهاتـەی ئابووری- کۆمەڵایەتیی کۆمەڵی کوردیدا نەدەهێنا و لاوازی نەدەکرد، بـەڵکو نـاڕەزایی خەڵکی دژی حکومەت زیاتر دەکرد.

ڕۆژی یەکەمی کانونی دووەمی (١٩٣٠) حکومەتی تورکیا بڕیـاری دا بەشـێك لـە کوردەکانی دانیشتوانی دەرسیم بـە زۆر ڕاگـوازێ و کۆچـیان پـێ بکـات بـۆ ویلایـەتی ئیلیازیس. تەواوی موڵکی ئەو خەڵکە لە لایەن حکومەتەوە دەستی بەسەردا گیرا، جگە لەمە کوردەکان دەبوایە پارەی ئەو پارچە زەوییەش بدەن کە بۆیـان دیـاریکرابوو. بـەڵام خەڵکی دەرسیم ناڕازیبوون لەم بڕیارە و ئامادە نەبوون خاکی خۆیان بەجێ بێڵن .

ئەو کاتە ئەنجومەنی وەزیران بڕیارێکی دەرکرد کە نرخی ئەو زەویانە دیاری بکرێـت کە بەسەر کوردە نیشتەجێبووەکاندا دابەشکرابوون بۆ ئەوەی نرخی ئـەو پارچـە زەویانـە بژمێرن (٣٥،لا، ١٦٥)، بە گوێرەی ئەم بڕیارەی ئەنجومەنی وەزیران لە (١٨) ی ئـازاری (١٩٣١) دا ئەم دۆخە لە هەموو ناوچەکانی یەکەم چاودێری گشتیدا بڵاوبۆوە، واتـە لـە ویلایەتەکانی ئاگری، وان، موش، بیتلیس، هەکاری، سیرت، ماردین، دیاربەکر، ئورفە، ئیلیازس، لەگەڵ ناوچەی دەرسیمدا (٢٠لا، ٣٢١)، بەڵام ئەم بڕیارە کوردەکـانی هـێمن نەکردەوە، هەرچەندە ئەوان هیوایان نەدەخواست خاکی باب و باپیرانیان جێ بهێڵن. لـەم بارودۆخەدا وەزارەتی داد پرۆژە یاسای دۆخی نائاسایی ئامادەکرد بە ئامانجی پەلەکردن و خێراییکردنی پرۆسەی دادگەیی. بـە گـوێرەی ئـەم یاسـایە حـوکمی دادگـە لـە بـارەی (باندیتیزم)،(چەتەگەری)و لە بارەی پیلانگێڕانەوە دژی دەوڵەت، دەرفـەتی پەشـیمانی و شکات لێکردن نەبوو، بەڵکو دەبوایە بە پەلە جێبەجێ بکرێت. حوکمی ئەم یاسـایە بـە شێوەیەکی سەرەکی لە ناوچەکانی یەکەمین چاودێری گشتیدا بڵاوکرایەوە، لەم بارەیـەوە ڕۆژنامەی ئاکشام نووسیبوی: هیچ گومان لەوەدا نیە کە لەسەر ئەو خاکـە سـایکۆلۆژیا سەرەتاییەدا ڕق و قینە و خوێنی ناوچەیی بەردەوامن لە خۆ زاڵکردن، نـاکرێ ئاسـایش تیایدا بەرقەرابێ، پرۆسەی دادگەی تێدا بەردەوامبێ، کە لەسـەر نمونـەی ئـەڵمانی بـێ،

ئامانجی ئەم یاسایە بە پەلە دابینکردنی ئاسایشە، دوورخستنەوەی تاوانبارانە کە دەیانەوێ درێژە بەم پرۆسەیە بدەن کە ئەمڕۆ بوونی هەیە(٤٨، ٢٩، ٣، ١٩٣٠)، بەلام کاربەدەستانی یەکەمی چاوێری گشتی هیچ ڕوویێکی کێشەکانی کوردی پێ چارەسەر نەکرا و لە ڕاستیدا هیچ کام لە بەرژەوەندییەکانی گروپە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەڵی کوردی پێ ڕازی نەکرا: نە جوتیارانی گوندنشین ، نە کۆچەرەکان، نە کوردە ڕۆشنبیرەکان، نە بازرگان و بۆرژوا، نە ئاغا و دەرەبەگ، لەگەڵ ئەوەشدا نارەزایی سیاسەتی دەسەلاتدارانی ئەنقەرە، ئەمانی لەسەر حوکم لانەبرد. لە کۆتایی سالانی بیستەکان دا ئەم نارەزاییەی جەماوەر بووە هۆی سەرهەلدانی جولانەوەیەکی شۆڕشگێڕی نوێ دژی حکومەتی ئەنقەرە لە ئارارات.

لە ناوەڕاستی ئایاری (١٩٢٨) دا ئەنجومەن لیژنەیەکی ((ئاشتبوونەوەی)) دروستکرد کە لە (١٢) ئەندام پەرلەمان و چەندین کاربەدەستی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات پێکهاتبوو. ئەم لیژنەیە چاوی بە نوێنەرانی کورد کەوت کە بە سەرۆکایەتیی(ئیحسان نوری پاشا) هاتبوون و لە ناوچەیەکی بێلایەن بە ناوی شێخی کوێر و کە شۆڕشگێڕان لە ناوچەکانی ئارارات رزگاریان کردبوو. ئەندامانی لێژنەکە لە چاوپێکەوتنیاندا لەگەڵ (ئیحسان نوری)، جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە حکومەت لێبووردنی گشتی بۆ هەموو کوردەکان دەردەکات و پۆستێکی گەورەش بۆ ئەو لەناو دەولەت دانراوە، بەلام لە بری ئەوە کوردەکانیش دەبێ چەکەکانیان دابنێن و خۆیان بەدەستەوە بدەنە سوپای تورکیا.

نوێنەرانی کورد پێشنیازی لیژنەی ((ئاشتبوونەوەیان)) رەتکردەوە، جەختیان لەسەر ئەوە کرد کە تاکە ڕێگە بۆ ئاگربەست داننانی تورکیایە بە مافی نەتەوەیی کوردستان. لە ئەنجامدا دانوستانی (شێخ کوێر)هیچی بە دەستەوە نەدا (١٩، لا، ٢٨) .

لە قۆناغی ڕاپەڕینی کوردستاندا بۆرژوای تورك سیاسەتی شۆڤێنیستانەی خۆی پەرە پێدا بە تایبەت سیاسەتی تواندنەوەی کەمە نەتەوەییەکان لە ولاتدا. بەم شێوەیە لە (٣٠) ئابی (١٩٣٠) دا (عیسمەت پاشا) بە بۆنەی کردنەوەی ڕێگەی ئاسنینی سیواس وتی: تەنها نەتەوەی تورك مافی داواکردنی نەتەوەیی و نەژادیی لەم ولاتەدا هەیە، هیچ توخم و ڕەگەزێکی تر بۆیان نیە ئەو مافە داوا بکەن (٦٢، ٣١، ٨، ١٩٣٠) .

لەمەش کراوەتر وەزیری داد بوو (محمود عزەت بێگ)، کە لەبەردەم دەنگدەران دا لە ئۆدێمیشی وتی: ئێمە لە تورکیا دەژین، ئازادترین وڵاتی دنیایە. نوێنەرتان بەوپەڕی کراوەییەوە لە بارەی بیروباوەڕییەوە ناتوانێ لەم وڵاتە باشتری دەستکەوێ. لەبەرئەوە ناتوانم هەستی خۆم بشارمەوە. تورك گەورەیە، تاقە خاوەنماڵی وڵاتە، ئەوەی بە رەگەز تورکێکی خاوێن و پاك نەبێ تەنها یەك مافی لەم وڵاتەدا هەیە ئەویش ببێتە خزمەتکار، ببێە کۆیلە. با دۆستان و دوژمنان ئەو راستییەیان لە بیر بێ، با چیاکانیش ئەوە بزانن (٦٢ ، ١٩، ٩، ١٩٣٠) .

لە کاتی کردنەوەی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیادا ئەنجومەن لە یەکی نۆڤەمبەری (١٩٣٠) دا، (مستەفا کەمال) لە هەڵسەنگاندنی بارودۆخی سیاسیدا وتی، ئەو رووداوانەی کە لە رۆژهەڵاتی تورکیا روودەدەن هەڕەشە لە سەربەخۆیمان دەکەن. (٢٢ب١، لا، ٣٤٩) بەم شێوەیە دەبینین خەبات و تێکۆشانی گەلی کورد لە پێناوی بە دەستهێنانی مافە نەتەوەیەکانیدا لە لایەن دەسەڵاتدارانی تورکەوە وەك هەڕەشە بۆ سەر سەربەخۆیی تورکیا تەماشا دەکران.

لە ژێر رۆشنایی باسەکانی پێشوماندا زەحمەت نییە لەوە تێبگەین، کە بۆچی کوردەکان بە هەموو توانا و هێزی خۆیانەوە خەبات دەکەن بۆ ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی تورك رزگاریان بێت .

لە دوای سەرکوتکردنی شۆڕشی ئارارات حکومەتی تورکیا بەردەوام بوو لە گرتنەبەری جۆرە سیاسەتێك کە بە رای ئەوان رێگە لەسەر هەڵدانەوەی جوڵانەوەیەکی تری کوردی دەگرن. بۆ ئەم مەبەستە وەك چۆن لە دوای شۆڕشی شێخ سەعیدی ساڵی (١٩٢٥) دەستیان پێکردبوو، ئەمجارەش راگواستنی خەڵکی کوردیان بۆ ناوەڕاست و رۆژئاوای ئەنادۆڵ دووبارەکردەوە بە مەبەستی تواندنەوەیان لەناو تورکەکانی ئەو ناوچانەدا .

بەهاری (١٩٣١) سەر لە نوێ جوڵانەوەی کوردی لە ئارارات تین و گوڕی وەبەرهاتەوە. بۆ ئەوەی پریشکی ئاگری ئەم شۆڕشە تەشەنە نەکات بۆ ناوچەکانی تری کوردستان، حکومەتی تورکیا رایگەیاند کە ناوچەی ئارارات ناوچەیەکی قەدەغەیە (٤٨،

٢، ٥، ١٩٣١)، جگە لە هێزی سەربازی هیچ کەسێکی تر بۆی نەبوو بچێتە ئەو ناوچەیە .

جولآنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد نەك هەر ترسی خستبووە ناو دلّی حکومەتی تورکیا، بەلکو حکومەتەکانی ئێران، عێراق و سوریاش تووشی نارەحەتی کردبوو. ئەگەرچی جیاوازییەکی زۆر کەم لە سیاسەتی ئەم ولآتانە بەدی دەکران، بەلآم هەموویان لە دژایەتیکردنی خەباتی نەتەوەیی کورددا هەلّوێستیان یەك بوو، بوونی چەندین رێککەوتننامەی جیاجیا و مۆرکردنی لە لایەن ئەو ولآتانە راستی بۆچونەکانمان دەسەلمێنن، بە تایبەت لە نیوەی دووەمی سالآنی بیستەکانی سەدەی بیستەم و سەرەتای سالآنی سییەکان و هەروەها جێبەجێکردن و هەنگاونانی کردەکی گشتیان بەو ئاقارە ئاراستەکرابوون بۆ لەناوبردنی جولآنەوەی کوردی لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا بێت.

بەم جۆرە لە(٥) حزیرانی (١٩٢٦) دا رێککەوتننامەیەك لە نێوان بەریتانیا و عێراق و تورکیا مۆرکرا کە تیایدا هاتووە: حکومەتی تورکیا و عێراق بە هیچ جۆرێك پەیوەندی دیبلۆماسی یان فەرمی نابەستن لەگەلّ هیچ کام لە سەرۆك عەشیرەت و شێخ و هاوولآتییانی ولآتی تر، رێگر دەبن لە بەردەم هەر جۆرە کۆبوونەوە و رێکخراوێکدا کە لەسەر سنووری یەکتر پڕوپاگەندە دژی ولآتی یەکتر بکەن (٣، ٤، ٣، bun، م. ١٩٢٩، لا٣١٠، ٣١١) ئەم رێککەوتننامەیە بوو بە بنەمایەك بۆ هاوکاریکردنی نێوان عێراق و تورکیا لەسەر کێشەی کورد. هەر لەو سەردەمەدا هەست بە نزیکبوونەوەیەك دەکرا لە نێوان تورکیا و حکومەتی شای ئێراندا. لە نیسانی(١٩٢٦) دا لە تاران رێککەوتننامەیەك لە نێوان تورکیا و ئێران دەربارەی ئاشتی و ئاسایش مۆرکرا، هەندێ لە بڕگەکانی ئەو رێکەوتننامەیە پەیوەندی بە هاوکاری ئەم دوو ولآتەوە هەبوو بۆ سەرکوتکردنی جولآنەوەی کوردی.

بە گوێرەی ئەم رێککەوتننامەیە هەر دوو دەولّەت پابەندبوون بەوەی کە لەناو خاکی خۆیاندا رێگە بە هیچ جۆرە رێکخراو وگروپێك نەدەن دروست بن کە ئامانجیان تێکدانی ئاشتی و ئاسایشی ولآتی بەرامبەر بێ یان گۆڕینی سیستێمی حوکمڕانی بێت، هەروەها

لایەنەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە دەتوانن داوای ئەو کەسانە یان گروپانە لە یەکتر بکەن کە خەبات لە دژی وڵاتی بەرامبەر دەکەن. (لاپەرە ٥)

بە ئامانجی دابینکردنی ئارامی و ئاشتی بۆ دانیشتوانی نزیك سنوورەکان، لە مادەی شەشەمی ئەم ڕێکەوتننامەیەدا هاتووە :

- هەردوو لایەنی ڕێککەوتوو پێویستە هەنگاوی گرنگ بنێن بۆ نەهێشتنی تاوانکاری و دزەکردنە ناو سنووری یەکتر کە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە هەردوولا، بە تایبەت کە لە لایەن ئەو عەشیرەتانەوە ئەنجام دەدرێن کە لە ناوچەکانی سەرسنوورەکان دەژین. (هەمان سەرچاوە لاپەرە- ٣٠٤-٣٠٥).

لە ترسی یەکگرتنی عەشایری کورد و ئەنجامدانی چالاکی بە هاوکاری یەکتر، هەردوو دەوڵەت لە هەمان ساڵدا بە گوێرەی مادەی (٧) ی ئەو ڕێککەوتننامەیە لەسەر نەهێشتن و وەلاوەنانی هەر جۆرە ڕووداوێکی سەر سنوورەکان ڕێککەوتن.

لە ڕاستیدا ئەمە ڕێککەوتنێك بوو بۆ کاری هاوبەشی نێوان هەردوو دەوڵەت بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردی.

لە (٣٠) ئایاری (١٩٢٦) دا ڕێککەوتنێك لە نێوان تورکیا و فەرەنسادا (کە ئەو کات سوریا و لوبنان لە ژێر ئینتیدابی فەرەنسادا بوون) بە ناوی دۆستایەتی و دوو دراوسێ ی چاك مۆرکرا.

پرۆتۆکۆڵی ژمارە (٨) لە بارەی چاودێری سنوورەکان تۆمارکران کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کوردەوە هەبوو لە خوارەوە بە کورتی دەقی ناوەرۆکی ئەم پرۆتۆکۆڵە دەنوسین:

مادەی یەکەم: لایەنەکانی پایە بەرزی ڕێککەوتوو بە هەموو هێز و توانای خۆیان پابەند دەبن بە لەناوبردنی گروپی چەکدار و چەتەکان کە دەبنە هۆی ئاژاوەنانەوە لەسەر سنوورەکان و دەیانەوێ سنوور ببەزێنن.

مادەی سێیەم: پێکهاتەی دەسەڵاتەکان ، بە پێی توانا سەردانی یەکتر دەکەن لە بارەی هەر ڕووداوێکی وەك چەتەیی و شەڕ لایەنەکەی تر کە ئاگادارکراوەتەوە، دەبێ

هەوڵ بدات بۆ گرتنی تاوانباران لە بەزاندنی سنووردا بە هەموو ئەو هێز و ئامرازانەی کە لە بەردەستیان دایە.

مادەی چوارەم: لە حاڵەتێکدا ئەگەر یەکێك یا چەند چەکدارێك تاوانێك ئەنجام بدەن لە خاکی وڵاتی دراوسێ و دواتر بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان ئەوا دەسەڵاتدارانی دوایین ناوچە لە سەریەتی بیانگرێ و بە چەك و کەل وپەلەوە تەسلیم بە وڵاتەکەی خۆی بکاتەوە کە تاوانبار هاووڵاتی ئەو وڵاتەیە. (٣٠٩٧٣ – ٣١٥) .

بە گوێرەی رێککەوتننامەی (٣٠) ئایار(١٩٢٦)، (٢٩) ی حزیرانی (١٩٢٩) لە نێوان تورکیا و سوریا کە لە ئەنقەرە مۆرکرابوو بە تایبەت (پرۆتۆکۆل لە بارەی چاودێری کردنی سنوورەکانی و لە بارەی باج و کۆنترۆڵ کردنی هۆزە کۆچەرییەکان) بە گوێرەی ئەم پرۆتۆکۆڵە هەردوو حکومەت پابەند دەبن بەوەی کە رێگە بە هیچ کام لە گروپە چەکدارەکان نەدەن ناوچە سنوورییەکان بەکاربێنن بۆ هێرشکردنە سەر وڵاتی دراوسێ. لایەنەکان ئاگاداری یەکتر دەکەنەوە لە بارەی هەر پەلامارێك و رێگر دەبن لە بەردەم پەرینەوەی هەر جۆرە چەتەگەریەك-لە سنوورەکاندا (م،٢) .ئەگەر هەر تاوانێك لە لایەن باندەکانەوە لە ناوچە سنوورییەکان بکرێت و تاوانباران بیانەوێ خۆیان لە ناوچە سنوورییەکان بشارنەوە، ئەوا دەسەڵاتدارانی ناوچەکە پێویستە بە کردەوە هەنگاوبنێین بۆ گرتنیان و بەرپرس کردنیان. (مادەی ٣) .

هەر عەشیرەتێك یان هۆزێك لە دژی حکومەتەکەی خۆی راپەڕیبێ کە مۆڵەتی لەو حکومەتە وەرگرتووە بۆ کۆچەری و خزاوەتە ناو خاکی وڵاتی دراوسێ و داوای پەناهەندەی بکات، پێویستە چەك بکرێت و بۆ مەودایەکی چاك لە سنوور دووربخرێتەوە و توانای هەڵگەڕانەوەی لە دەسەڵات لێ زەوت بکرێت. مادەی (١١)(١٤ لاپەرە ١٧٥).

ئەم هەموو رێککەوتن و پەیماننامایە، شایەدی ئەوەن کە دەسەڵاتدارانی تورك لە چوارچێوەی (چارەسەرکرنی) کێشەی کوردیدا چەندین پشتیوانی هەبوون لەوانە : ئێران و وڵاتانی تری دراوسێ لە رۆژهەڵاتی نزیك دا.

لە خوارەوە هەندێ لەو چالاکییە سەربازییە تەمێکەرانەی تورکتان بۆ باس ئەکەین کە لە بەهار و هاوینی (١٩٢٩) دژی شۆڕشی کوردی ئامادەکرابوون.

٢. پێش ئەوەی باس لە ئۆپەراسیۆنەکان بکەین دەستنیشانی ناوی کەس و گوندەکان بکرێت کە لە دژی حکومەت راپەڕیبوون و ئەوانە بدرێنە سەرکردایەتی سوپا.

٣. ئامانج- عەشیرەتی ژیلیان، ئاشکرایە کە عەشیرەتەکانی دێرشێڤی، باتمان کە لە ناوچەکانی پێروانی دەژین دەتوانن یارمەتی عەشیرەتی پێشوو بدەن.

٧. لە کاتی ئەنجام دانی ئۆپەراسیۆنەکە (چالاکی عەسکەری) مەبەستمان ئەم هۆکارانەیە:

a. پێویستە ئامانجی ئەم ئۆپراسیۆنە زۆر شاراوە بێت، سەربازەکان تا دەسپێکردنی چالاکییە سەربازییەکان هیچ نەزانن.

لە دەوروبەرەکەدا وا بلاوبکرێتەوە کە شت بۆ گواستنەوە ئامادە دەکرێت لە سوریاوە بۆ دیاربەکر و ماردین.

b. بۆ ئەوەی لە کاتی ئۆپەراسیۆنەکەدا هیچ کەس لە دانیشتوانی گوندەکان هەواڵ بۆ لایەنی دژ نەبەن پێویستە ئەو گوندنشینانە دەستبەسەر بکرێن .

c. زۆر گرنگە ئۆپەراسیۆنەکان بە پەلە و خێرایی ئەنجام بدرێن. سەرکوتکردن و راونان پێویستە زۆر بێ بەزەییانە بێت.

٨. پێویستە هەر لە ئێستاوە ئامادەبن بۆ دەست بەکاربوون، بۆ ئەوەی لە کاتی پرۆسەی تەمبێکردندا کە دژی یاخی بووان ئاراستە دەکرێ، مەبەستی لەمانەی خوارەوەیە:

a . داوا لە عەشیرەتی ژیلیان بکرێ چەك دابنێن.

b. پێویستە ئەو کەسانە تەسلیم بە حکومەت بکرێن کە ژاندارمەکانیان کوشتبوو ئەوانیش رەسوڵ و ئاگێتی برایەتی.

ئەگەر وانەکەن ئەوا حکومەت پێ ی وایە ئێوە یاخی بوون و گوندەکە خاپور دەکرێ، هەروەها مەڕو ماڵات و خواردەمەنی و...... هتد، بە هیچ جۆرێ قبوڵی ئەوە ناکرێ داواکراوان رابکەن .

٢. رێگە نادەین حکومەت هەڵبخلەتێندرێ لە رێگەی بەڵێن و گفتوگۆی جیاجیاوە.

d. ئەو بەتالیۆنەی کە لەگەڵمان دێت تەسلیم بـە ئەفـسەری ژانـدارم یوسـف زیـاو دەکرێ.

لە سەرەتای ساڵانی (١٩٣٠) دا دەسەڵاتدارانی تورك دەستیان کرد بـە ئەنجامـدانی کرداری سەربازی و پۆلیسی و ئیداری، کە بە رای ئـەوان دەبێتـە هـۆی سـەرکوتکردنی جولاَنەوەی رزگاریخوازی کورد.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە چاودێریکردنی گشتی یەکـەم لـە یەکـەم رۆژی کـانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٨) دا دەست بەکاربوو کە سەنتەرەکەی لە دیاربەکر بوو.

دواتر ویلایەتی ئاگریشی بۆ زیادکراو لە ئەنجامدا ژمارەی ویلایەتەکان زیادیان کردو بوون بە (٩) ویلایەت.

لە ساڵی (١٩٢٩) دا (ئە ب ن ت) یاسای ژمارە (١٥٠٩) ی پەسەندکرد کە بە پێ ی ئەم یاسایە ویلایەتی بیتلیس هەڵوەشێندرایەوە و لـە جیـاتی ئـەو ویلایـەتی مـوش دروست کـرا. لـە سـاڵی (١٩٣٣) دا یاسـای ژمـارە (٢١٩٧) شـەش ویلایـەتی تـری هەڵوەشـاندەوە، ناوەکانیـان : هـەکاری جبـل بـەرەکات، ئانـسەرای، ئـارتڤین، ئێیـل، شێبینکەراخی سار لە ئەنجامدا ژمارەی ویلایەتەکان کەمبوونـەوە و بـوون بـە ٥٧ (٢٧ لاپەڕە ١٨٩) .

بە گوێرەی یاسای ژمارە (١١٦٧) لە (٢٠) ی حزیرانـی (١٩٢٧)، (١٩) شـوباتی (١٩٣٤) لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا چـاودێریکردنی گـشتی دووەم دروسـت کـرا کـە پێکهاتبوو لەم ویلایەتانە: کرکلەرێلی، تێکرداغ، ئەدرنە، چـەنەکاڵی. سـەنتەرەکەی لـە ئەدرنە بوو.

دیسان بە پێ ی یاسای ناوبراو چاودێری گشتی سێیەم لە (٦) ی ئـەیلولی (١٩٣٥) دا دروستکرا، کە پێکهاتبوو لەم ویلایەتانە: ئاگری، ئێرزەروم، ئەرزنجان، قارس، ریـزێ، تابزۆن، گوموشخانە.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد و باسمان کرد لە (٢٥) ی کانوونی یەکـەمی (١٩٣٥) دا یاسای ژمارە (٢٨٨٥) پەسەندکرا کە لە بارەی دامەزراندنی چـاودێریکردنی گـشتی یەکەمەوە بوو کە ئەو ویلایەتانە دەگرێتە خۆ: هـەکاری، بینگـۆل، بیتلـیس، تونجـەلی.

ویلایەتی ئارتڤین بە جیا دروستکراو خرایە سەر چاودێری گشتی سێ یەم دیسان بە گوێرەی یاسای ژمارە (١١٦٤) لە (٢٠) ی حزیرانی (١٩٢٧) ویلایەتەکانی تونجەلی و بینگۆل و ئێلیازیگ پێشتر سەر بە چاودێری گشتی یەکەم بوون، ئێستا ئەم ویلایەتانە چاودێری گشتی چوارەم پێك دێنن (٢٧ لاپەڕە ١٩٠) .

لە سەرەتای ئایاری (١٩٣٢) دا هەروەك کوردناس(لوسێن رامبۆ) دەنووسێ: یاسایەك پەسەندکراو بە گوێرەی ئەمە لە تورکیا چوار هەرێم دروست کران. سێ دانەیان لە کوردستان رێکخران، یەکێکیان بە هۆکاری – تەندروستی، مادی، کولتووری، سیاسی و خەسڵەتی ستراتیجی بە ئامانجی دابینکردن و بەرقەرارکردنی ئاسایش، دەبوایە هەر هەمووی رابگوازرێ و ببێتە ناوچەیەکی قەدەغەکراو. دوو بڕگەی یەکەمی یاساکە دەسەڵاتیان داوەتە حکومەتی تورکیاکە هێزی عەسکەری و پۆلیس بەکاربێنن بۆ لەناوبردنی یەکێتی هۆزو عەشیرەتەکان، نەریتی شێخایەتی و سەرۆك عەشیرەتی لەناو ببەن و هەڵیبوەشێننەوە.

بە پێی بڕگەی سێیەم تەواوی مولکی جێگیری (الأموال ألغیر منقولة) عەشیرەتەکان دەبوونە مولکی دەوڵەت، بڕگەی چوارەم وا پێشبینی کرا ئەو زەویانەی دەستی بەسەرداگیرابوو بدرێتە ئەو تورکانەی کە لە وڵاتانی بەلقانەوە بۆ تورکیا کۆچ دەکەن.

بەم شێوەیە دەسەڵاتدارانی تورك لە لایەك هەوڵیاندەدا بنەما ئابوورییەکانی بوونی عەشایر لەناو ببەن و لە لایەکی تر رەگەز و نەتەوەی تورك لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا نیشتەجێبکەن کە بە رای ئەوان دەبووە رێگر لە بەردەم سەرهەڵدانەوەیەکی نوێ ی بزاڤی کوردیدا .

بڕگەی پێنجەم دەسەڵات و مافی دەدا بە دەسەڵاتدارانی تورك ئەگەر گومانیان لە کەسێك بکردایە جاسوسە ئەوا بە خۆی ماڵ و خێزانەوە دووریان دەخستەوە.

بڕگەی( ٦و٧ ) باس لەوە دەکات هەندێ هەنگاو بنرێت بە مەبەستی ئەوەی کوردەکان زمانی خۆیان بیرچێتەوە و هەروەها لەو ناوچانەی کە لێی نیشتەجێ دەکرێن تەنها خەریکی کارکردن بن.

لە کۆتاییدا بڕگەی هەشتەم باس لەوە دەکات کە لەو ناوچانەی کوردی تیا نیشتەجێ دەکرێن نابێ ژمارەی کوردەکان زیاتری لە (١٠%) ی تورکەکانی ناوچەکە بن.

لە درێژەی سیاسەتی گرتنە بەری راگواستن و تواندنەوەدا لە(٩) ی حزیرانی (١٩٣٤) (ئە ب ن ت) ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا یاسای ژمارە (٢٥٠٢) ی پەسەندکرد سەبارەت بە نیشتەجێکردن لە هەندێ لە ناوچەکانی ویلایەتەکانی قارس، بایەزید، ئەرزرۆم و چۆروخدا پەناهند و موهاجر، کە پەیڕەو و راگوێزراوەکان پارچە زەوییان لە بەشی دانیشتوانی ئەو ناوچانەدا بەسەردا دابەشبکرێت. لە یاساکەدا هاتووە زەوی و موڵکی جێگیر کە پێشتر سەر بە روسیا بوون و مافی خۆیانیان لەوێدا بەکاردەهێنا و ئێستا ئەو ویلایەتانەیان بەجێ هێشتووە کە بریتیین لە ویلایەتەکانی قارس، بایەزید، ئیگدیر، توزلوجە، هەروەها قەزای ئۆلتی لە ویلایەتی ئەرزرۆم، ئارتڤین، شەوشات، بۆرچکە- لە ویلایەتی (چوروخ) بوون بە موڵکی دەوڵەت.

ئەم زەوی و موڵکانەی کە کەوتونەتە دەست دەوڵەت وەك موڵکی جێگیری تر لە ناوچەکانی دیکەدا، دەکرێ دابەش بکرێنە سەر ئەو راگوێزراو و جوتیارانەی کە زەویان نیە یان زەوی کەمیان هەیە. (مادەی I، ٢) (٧. بەرگی .١٥. لاپەڕە — ١١٢٢-١١٢٣).

لە راستیدا ئێمە ئاگاداری ئەم یاسایە نین کە تا چەند جێبەجێ کراوە و، ژمارەی ئەو راگوێزراوانە موهاجیرەکان چەند بوون کە لەو ویلایەتانە نیشتەجێ کراون و کام بەشەی خەڵك زەویان وەرگرتووە، بەڵام بە پێی هەندێ سەرچاوە لە نێوان ساڵانی (١٩٢٣-١٩٣٤ ) دا (٦٣٠) هەزار کەس بۆ ناو تورکیا کۆچیان پێکراوە و زۆربەی ئەمانە ناردرابوون بۆ ویلایەتەکانی رۆژهەڵات. بەڵام روون و ئاشکرایە کە ئەم کردەوانەی حکومەت لەبەر خاتری جوتیاری کوردی بێ زەوی نەبوو، ئەوەندەی پەیوەندی بە ئارەزووی دەسەڵاتدارانی تورك خۆیانەوە هەبووە بۆ جێگیرکردن و نیشتەجێ کردنی رەگەزی تورك لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا لەسەر حسابی کورد و ئەرمەنیەکان. بەڵگەشمان بۆ ئەم بۆچونەمان یاسای ژمارە (٢٥١٠) یە کە لە لایەن(ئە ب ن ت) دەربارەی نیشتەجێ کردن لە (١٣) حزیرانی (١٩٣٤) دا بڕیاری لەسەردرابوو. ئەم

یاسایە بە رووکەش باسی تورکە راگوێزراوەکانی کردبوو، بەڵام لە ناوەرۆکدا لە دژی کەمە نەتەوەکان و بە تایبەت دژی کورد ئاراستەکرابوو. بە گوێرەی ئەم یاسایە تورکیا دابەش کرابووە سەر سێ هەرێم:- یەکەم ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کە کولتووری تورکی تێدا چڕببۆوە، دووەم- دەستنیشان کرابوون بۆ تێکەڵاوی نیشتەجێ بووەکان و تەرخان کرابون بۆ ئەوەی لەگەڵ کولتووری تورکیدا لێ رابێن. هەرێمی سێیەم ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کە بە هۆکاری تەندروستی، ئابووری، کولتووری، سیاسی و عەسکەری، هەروەها بە مەبەستی بەرقەرارکردنی ئاسایش پێویستی بە راگواستنێکی سەرتاسەری هەبوو نیشتەجێ بوون و هاتوچۆی تیا قەدەغە بوو.

دیارە ئەم ناوچانە دانیشتوانەکانیان گشتیان کوردن مەبەستیش لەوە بوو کە هەر هەموویان راگوێزرێن (٧،ب،١٥،لا،١١) .

ئەنجومەنی وەزیران ماف و و دەسەڵاتی پێدرا بۆ ئەوەی گوندنشین و کۆچەرەکان لە هەرێمی ژمارە (٣) رابگوازن بەسەر ناوچەکانی تر و دابەشیان بکەن، بە لەبەرچاوگرتنی دۆخی تەندروستی و ژیاریان .

وەزیری ناوخۆ دەیتوانێ گومانی جاسوسی لە هەر کەسێك بوایە لە ناوچە سنوورییەکان دووری بخستایە بۆ ناوچەیەکی تر، هەروەها لە وڵات ئەوانەی کە بێگانەن و وابەستەی (تبعیة) بێگانەیان هەیە وەزیری ناوخۆ بۆی هەبوو قەرەج و کۆچەریش کە ئەم وڵات و ئەو وڵات دەکەن و لەگەڵ کولتووری تورك تێکەڵاو نابن دەریان بکات (٧ب١٥ لا ١١٥٧-١١٥٨) .

مادەی (١٠) ی ئەم یاسایە کە تەواو پەیوەندی بە کوردەوە هەبوو دەڵێ:

a. یاسا دان بە مافی کەسایەتی یاسایی عەشایردا نانێ، تەنانەت ئەگەر ئەو مافانە لە لایەن دادگەشەوە بڕیاری لەسەر درابێ و بە هەر بەڵگەیەکیش بێت، هەموو دەسەڵاتەکانی سەرۆك، ئاغا، بەگ، یان شێخی عەشیرەت، لەسەر دۆکۆمێنتێك بێت یاخود بە نەریت و عورف و عادەت ئەوا هیچ بنەمایەکیان نیە و هەڵدەوەشێندرێنەوە.

b. هەموو موڵکێکی جێگیر، تەنانەت ئەگەر تا پێش دەرچونی ئەم یاسایە دانی پیانرابێ و لەسەر هەر بەڵگەنامەیەك بێت و بسەلمێنرێ کە ئەمە موڵکی سەرۆك

عەشیرەتە، وەك کەسایەتییەکی یاسایی ئەوجا چ شێخ، بەگ یان ئاغای عەشیرەت بێت ئەوا لێ دەسەندرێتەوە و دەبێتە مولکی دەوڵەت. بە گوێرەی ئەم یاسا و پرینسیپە دەوڵەت بریتییە لە مولکی جێگیر و بەسەر تورکە موهاجیرەکاندا دابەش دەکرێت.

c. پشت بەستن بە بڕیارەکانی حکومەت، وەزیری ناوخۆ ماف و دەسەڵاتی هەیە لە هەندێ لە ناوچەکان و سەرۆك عەشیرەتەکان، بەگ و شێخ و ئاغا بە خۆیان و ماڵ و خێزانیان لە شوێنێکی تر بگوازرێتەوە و تێکەڵاوی ناوچەیەکی تریان بکات ئەگەر هات و گومانی لێ بکرێ کە مەترسی لەسەر سنوورەکان بۆ ئاسایشی دەوڵەت دروست دەکەن (٧ب ١٥ لا ١١٥٨-١١٥٩)

لە کاتێکدا حکومەتی تورکیا هەوڵی لەناوبردنی سەروەت و سامان و دەستکەوتی سەرۆك عەشیرەتەکانی کوردی دەدا، لە هەمان کاتدا هیچ پلان و مەبەست و بەرنامەیەکی نەبوو بۆ چاککردنی دۆخی ئابووری و کولتووری و ئاستی گوزەرانی زەحمەتکێشانی کورد، یان لە بەرامبەر هەندێ ئاغا و شێخ داکۆکی لە هەژاران بکات، یان نەخواستە کێشەی کشتوکاڵی بە جۆرێ چارەسەر بکرێت کە لە بەرژەوەندی زۆربەی خەڵك دابێت. بەڵکو تەنها هەوڵی حکومەت هەوڵی بۆ ئەوەبوو نەتەوەی کورد بکاتە بابەتی چەوساندنەوە و تواندنەوە.

لە مادەی یازدەی ئەم یاسایەدا هاتووە:

a. بۆ هەر کەسێك ئەگەر زمانی تورکی زمانی دایك نەبێت ئەوا دروستکردنی گوند و گەڕەکی لێ قەدەغە دەکرێ، دروستکردنی رێکخراوی کرێکاری و پیشەیی لێ قەدەغە دەکرێ.

b. ژمارەی ئەو ئاوارانەی کە لە هەندێ لە شارەکاندا مافی نیشتەجێبوونیان دراوەتێ نابێ ژمارەیان(١٠٪) تێپەڕ بکات لە چاو تورکنشینی شاردا،

c. هەروەها هیچ رێگەیان پێنادرێ گەڕەکی تایبەت بە خۆیان لەناو ئەو شارەدا دروست بکەن. (٧بەرگی ، ١٥، لا- ١١٥٩)

بە ئامانجی زیادکردنی ژمارەی دانیشتوانی تورك لە ناوچە کوردییەکاندا، حکومەت ئەو موهاجیرە تورکانەی کە لە یۆنانەوە هاتبونە ناوچە کوردیەکان قەدەغە کردبوو تا

(۱۰) ساڵ ناوچەکە بە جێبێڵن. مادەی (۲۹) لەم بارەیەوە دەڵێ: موجاهیرەکان-کۆچەرەکان کە لە لایەن حکومەتەوە تێکەڵاوی یەکترکراون لەو ناوچانە نابێ تا (۱۰) ساڵی کەمتر بە یەکەوە بژین . ئەوان ناتوانن بچن لە ناوچەیەکی تر بژین ئەگەر رەزامەندی وەزیری ناوخۆ وەرنەگرن (۷ بەرگی، ۱۵، لا-۱۱٦٥).

بە هەمان شێوە کورد و کەمە نەتەوەکانی تریش قەدەغەکرابوون بە بێ ئیزنی حکومەت ئەو ناوچانە بەجێبێڵن، خۆ ئەگەر (۱۰) ساڵەکەش بەسەر چویا، ئەوا ئەوان بە بێ رەزامەندی حکومەت بۆیان نەبوو برۆن لە ناوچەیەکی تر و لە شارێکی تر ژیان بەسەر بەرن و نیشتەجێ بن. بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایە حکومەتی تورکیا کۆمیتەیەکی دروستکرد کە لەوێدا وەزیری ناوخۆ، وەزیری بەرگری، وەزارەتی ئابوری و چەند وەزیرێکی تر ئەندامی ئەم کۆمیتەیە بوون، ئەم کۆمیتەیەی حکومەت بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیادا یەکسەر دەست بەکاربوو، یەکەم هەنگاویان بۆ بە راگواستنی کۆمەڵی کوردەکان بوو.

لە (٥) تەموزی (۱۹۳٤) دا بە یەکجار دوو یاسا پەسەند کران: یەکێکیان ژمارە — (۲٥۷٦) ئەویتریان (۲٥۷۷)، ئەم یاسایانە پێیان دەوترا یاسای گۆڕانکاری لە هەندێ مادەی یاساییدا سەبارەت بە رێکخراوی ناوەندی و ئەرکەکانی وەزارەتی ناوخۆ.

مادەی یەکەم کە پەیوەندی بە یاسای نیشتەجێبوونەوە هەبوو بەم شێوەیە بوو:

مادەی هەشتەمی یاسای ژمارە (۱٦۲٤) دەربارەی رێکخراوی ناوەندی و ئەرکەکانی وەزارەتی ناوخۆ بەم شێوەیەی خوارەوە گۆڕانی بەسەرداهات.

بەڕێوەبەرایەتی کاروباری خەڵك لە چوار بەش پێکهاتبوو:

a. بەشی یەکەم بە گوێرەی دۆخی یاسای نیشتەجێکردنی ژمارە (۲٥۱۰) پەیوەندی بە موهاجیرەکان، پەناهیندەکان، کۆچەرەکان، گواستنەوەی راگوێزراوەکان، تێکەڵاوکردنیان، بەرهەمهێنان، دەستنیشانکردنی ناوچەکان، زەوی بۆ بێ زەوییان و جوتیارانی کەم زەوی، هەڵوەشاندنەوە و لەناوبردنی کارەکانی پێشوو کە پەیوەندیان بە راگواستنەوە هەبوو . (۹، ۱۹۳٤، ژ، ۲٥۷۲) .

ئەو بەشە پێکهاتبوو لە (۳) (بیرۆ) نوسینگە و دوو فەرمانبەری سەربەخۆ.

b.  بەشی دووەم ئامانجی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە لەو حاڵەتانە بوو کە پەیوەندیان بە بوار و ئاقار و بەرەی کولتوورییەوە هەبووە لە نێوان هاوولاتیانی ولاتدا کە بیاندۆزێتەوە و هەنگاوی پێویست بنێ بە پێی مادەکانی( ٨، ٩، ١٠، ١١ ) ی یاسای (٢٥١٠) دەربارەی راگواستن و نیشتەجێکردن، هەروەها بەردەوامبێت لەو هەنگاوانە و لێیان ووردبێتەوە و دیراسەی ئەو کەسانەش بکات کە پەیوەندیان بە کولتووری تورکی یان خوێنی تورکەوە هەبێ، بە تایبەت ئەوانەی لە دەرەوەن و دەیانەوێ کۆچ بۆ ناو ولات بکەن، تا کارئاسانیان بۆ بکرێ و نیشتەجێبکرێن و پارچە زەوی بە پێتییان بدەنێ.

ئەم بەشە لە چوار نوسینگە پێکهاتبوو:

d.  بەشی سێیەم :ئامانجی جێبەجێکردنی ئەو کارانە بوو کە پەیوەندیان بە ئامارەوە هەبوو لەگەڵ خەڵك و ئامرازەکانی پەیوەندیکردندا، ئەمەش لە دوو نوسینگە پێکهاتبوو .

e.  بەشی چوارەم : ئەو کارانەی دەکرد کە پەیوەندییان بە یاسای هاوولاتی و جێبەجێکردنی مافی بە هاوولاتیبوونەوە هەبوو، هەموو بریتی بوو لە دوو نوسینگە.

وەك دەبینین ئەم یاسایە زیاتر پەیوەندی بە کوردەوە هەیە، چونکە هاوکات بە گوێرەی ئەم یاسایە کۆنترۆڵی ناونووسین لەناو دوورخراوەکاندا دەکرێ، هەروەها سەرژمێریان دەکرێ بۆ ئەوەی لەناو کولتووری تورکەکاندا بتوێندرێنەوە.

لە(١٨) نۆڤەمبەری (١٩٣٥) دا ئەنجومەنی بالای نەتەوەی تورکیا یاسای ژمارە (٢٨٤٨)ی پەسەندکرد لە بارەی گۆڕانکاری لە یاسای نیشتەجێکردندا و دەستنیشانی ئەو ناوچانەی کردبوو کە کوردی تیا نیشتەجێبکرێت (٧بەرگی، ١٧،لا-٢٨ -٣٠) .

ئەم یاسایە دیدی وابوو کە ویلایەتێکی تایبەت بە ناوی تونجەلی دروستبکرێت، رووبەرەکەی بریتی بوو لە (٤٥٠-٥٠٠) کم چوارگۆشە. دوای پەسەندکردنی یاسای تونجەلی حکومەتی تورکیا بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەتی لە دەرسیم دروستکرد.

لە نیوەی یەکەمی تەموزی (١٩٣٥) دا کاتێك کێشەی کورد توندوتیژتر بۆوە، (عیسمت پاشا)سەر لە نوێ گەشتێکی تری بە ناو ویلایەتەکانی باشوری رۆژهەلاتی

تورکیادا کرد و بۆ ماوەی دوو هەفتە لە دیاربەکر و، ماردین ، سیرت، بیتلیس، وان، موش، بولانکیٚ، لازگرد، مایەوە. (٦،لا، ٦٣- ٦٤) .

لەم سەردانەیدا سەرکردەی ویلایەتەکانی لە سیاسەتی حکومەت ئاگادارکردەوە لە پرسی کوردی. یاسای ژمارە (٢٨٨٤) دەربارەی بەڕێوەبەرێتی تونجەلی بۆ ماوەی (١١) سالٚ کاریکرد، مادەی (٣٧) ی یاساکە ماوەی کارکردنی یاساکەی تا(١) ی کانونی دووەمی (١٩٤٠) دەستنیشانکرد و دواتر بە چەند یاسایەك ماوەی کارکردنی ئەم یاسایە چەند جارێك درێژ دەکرایەوە.

بە هۆی یاسای ژمارە(٣٧٠٦) ئەو بۆ ماوەی سیٚ سالّی تر درێژ کرایەوە، واتە یەکی کانونی دووەمی (١٩٤٣) بە هۆی یاسای ژمارە (٤٤٣٠) ماوەکەی بۆ دوو سالّی تر درێژکرایەوە کە دەکاتە تا یەکی کانوونی سالّی (١٩٤٥)، (٧.بەرگی ، ٢٠، ٢٦، لا-٤٥) .

سەرباری هەموو ئەو یاسایانەی کە پەیوەندیان بە کردەوەی سزادان، لێبوردن هەبوو، ناکریٚ بگوتریٚ کە لە تونجەلی سەرژمێری راست بۆ خەلّك کراوە، بەلّکو بە پێچەوانەوە دەسەلاّتدارانی تورك هەموو هەولّێکیان بۆ ئەوە بوو سەرژمێری راستەقینەی خەلّك نەکەن. لە سالاّنی (١٩٣٧ -١٩٣٨) ژمارەیەکی ئێجگار زۆری خەلّك دووچاری جینۆساید بوونەوە. لەو سالاّنە ئەوەندە خەلّکیان کوشت کە حیساب و ژمارەکانیان دەبردەوە سەر سالاّنی تر، لەگەلّ ئەوەشدا دەیانویست لەناوبردن و کوشتن و بڕین دابپۆشن. جگە لەمە هەر لەو دوو سالّەدا ئەوەندەیان مندالّ و زارۆك کوشتبوو کە مندالّی لەدایك بووی ئەو سالاّنەت نەدەدیت .

هەر لەو بارەیەوە هەندیٚ لە مندالاّن کە لە دایك بووی سالّی (١٩٤٠) بوون وا نیشان دەدران کە لە سالاّنی (١٩٣٧- ١٩٣٨) مردون. بەم شێوەیە جارێکی تر هەولّیان دەدا بە کۆمەلّ کوشتنی خەلّکی دەرسیم بشارنەوە (٢٧-لا-٤٨) .

بە یاسای ژمارە (٤٤٣٠) ، یاسای بەڕێوەبردنی تونجەلی بۆ ماوەی دوو سالّی تر درێژ کرایەوە، واتە تا یەکی کانونی دووەمی (١٩٤٥) . بە یاسای ژمارە (٤٦٧٨) ماوەی یاساکە بۆ یەك سالّی تر درێژکرایەوە، واتە تا یەکی کانوونی دووەمی (١٩٤٦).

بە یاسای ژمارە (٤٨٠٩) ماوەی کارپێکردنی یاساکە بۆ یەك ساڵی تر درێژکرایەوە، واتە تا (١) ی کانوونی دووەمی (١٩٤٧).

هۆکاری هەموو ئەو درێژکردنەوەی یاسایانە پەیوەندییان بە نەبوونی و دابیننەکردنی ئارامی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی ناوچەکەوە هەبوو .

درێژکردنەوەی ماوەی ئەو یاسایانە لەبەر نەبوونی ئارامی، ئاسایش، نیزام بووە. دەکرێ باس لە هەندێ لەو یاسایانە بکەین کە پەیوەندییان بە بەڕێوەبردنی دەرسیمەوە هەبووە. لە کانوونی دووەمی (١٩٣٨) دا یاسایەك پەسەندکرا کە پەیوەندی بە گۆڕینی یاسای ژمارە (٢٨٨٧) هەبوو، ساڵی (١٩٣٤) یاسای ژمارە (٢٥٧٦) دەرچوو تایبەت بە سەرژمێرکردنی دانیشتوان کە بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە دەرسیمەوە هەبوو. بە گوێرەی ئەم یاسایە ئەو خەڵکانە حسێب نەکرابوون کە لە دایك ببون، ژنیان هێنابوو، مردبوون، جیاببونەوە........هتد. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی دەرسیم ئەگەر بیانویستایە سەفەری ناوچەیەکی تر یان شارێکی تریان بکردایە دەبوایە مۆڵەت لە حکومەت وەرگرن. هەر کەسێك دەبوایە حسابی ووردی خۆی بە دیارخستبا لەو جێگەیەی کە سەفەری بۆ دەکات و بە هەمان شێوە کە دەگەڕایەوە ئاگاداری حکومەتی بکردابایە. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو کەسانەی کە لە شارەکانی ترەوە سەردانی دەرسیمیان بکردبا، دەبوایە بە کۆمەڵێك رۆتین تێپەڕن، ئەمە وا دەردەکەوت جۆرەها شێوەی پاسپۆرت هەبووبێ بۆ ئەوەی بتوانن لە دەرسیم بچنە دەرەوە یان میوان روویان تێبکات.

بۆ نمونە ئەگەر بتویستبا سەفەر بۆ فەرەنسا بکەی ئەوا دەبوایە پاسپۆرتت هەبێ ، بە هەمان جۆر ئەگەر بتویستبا لە دەرسیم بچیە دەرەوە دەبوایە پاسپۆرتت پێ بێ (٦٤- ctf – ٢٧) .

حکومەتی تورکیا زۆرجار خەڵکی دەرسیمی ئازار دەدا و سزایانی دەدا وەك ئەوەی ئەوان دۆخی یاسای ژمارە (٢٥٧٦) پێشێل کردبێ. ئەم جۆرە سزایە زیاتر خۆی لە سزای پارەدان و، زیندانیکردن دەبینییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی تورك جار جارە لێبوردنی بۆ خەڵکی دەرسیم رادەگەیاند بە شێوەیەك حوکمی زیندانییەکان کەمدەکرایەوە یان ئازاد

دەکران، بە تایبەتی ئەم لێبوردنە لە ژێر رۆشنایی یاسای ژمارە (٢٨٨٧) دا بوو کە لە (٨) ی کانوونی دووەمی (١٩٣٦) دا لە لایەن (ئ ب ن ت) پەسەندکرابوو، دەردەچوو.(٩، ١٩٣٦، ژ، ٣٢٥٤) (لە کانوونی دووەمی ١٩٣٦) .

چواردەی کانوونی دووەمی (١٩٣٨) یاسای ژمارە (٣٣٢٣) پەسەندکرا دەربارەی گۆڕاندنی هەندێ لە مادە و بڕگەکانی یاسای ژمارە (٢٨٨٧). ئەم یاسایە ناوی لێنرا (یاسا) سەبارەت بە وورده گۆڕانکاری لە بارەی یاسای (٣) ژمارە (٢٨٨٧) (٩ژ ٣٨١٩ -٢، ١، ١٩٣٨)

لە(٥) ی تەمووزی (١٩٣٩) دا (ئە ب ن ت) پشتگیری لە پرۆژەیەکی یاسایی کرد کە سنووردارکردنی چالاکی و کار و کرداری کوردبوو، ئەو کوردانەی کە بۆ ناوچەکانی رۆژئاوای وڵات راگوێزرابوون هیچ کات بۆیان نەبوو بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان.

ئەم یاسایە ئەو کەس و عەشیرەتانەی قەدەغەکردبوو کە نەژادیان تورك نەبوو و هیچ پەیوەندیەکییان بە کولتووری تورکییەوە نەبوو، سەر لە نوێ لە هەرێمی ژمارە (١) یەك نیشتەجێ ببنەوە (٧ب ٢٠ لا ١٥٥٦) کە بە شێوەیەکی سەرەکی بریتی بوون لە ویلایەتە کوردییەکان.

بە پێی یاسای ژمارە (٣٦٦٧) لە دیسەمبەری (١٩٣٩) دا حکومەتی بڕیاریدا کۆچەرە کوردەکان نیشتەجێ بکات، بۆ ئەم مەبەستە یەکە و پارچە زەوییەکی پێ فرۆشتن (٣٥،لا، ١٦٦- ١٧١) .

پێویستە باس لەوەش بکەین کە ئامار و ژمارەی هەموو ئەو کوردانەی کە لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتەوە بۆ ویلایەتەکانی رۆژئاوا راگوێزران نازانین و لەبەر دەستدا نین، بەڵام دەکرێ لەو دوکۆمێنتانە بیاندۆزینەوە کە لە ئامار و سەرژمێری خەڵکی ساڵانی (١٩٣٥) و (١٩٤٠) تێداکرد.

بەم شێوەیە ئەنجامەکان وا نیشان دەدەن کە تەنها لە ویلایەتەکانی ئەرزرۆم، موش، واندا لە نێوان ساڵانی (١٩٣٥- ١٩٤٠ ) دانیشتوانەکەی بە رێژەی (٣٣٨), (٢٨٠) کەس کەمبێوە. خۆ ئەگەر حیسابی ئەوەش بکەین کە دانیشتوانی وڵات لەو ماوەیەدا(١٠٪) زیادی کردبێت ئەوە مانای وایە کە لەو ویلایەتانەی باسمان لێوە کرد

نەك دانیشتوانەکەی نەدەبوایە کەمی بکردبا بەڵکو تا (١٠٠) هەزار کەس دەبوایە زیادببێ . بە کورتی ئەم کەمکردنەوەیەی باسمان لێوەکرد لە ژمارەی دانیشتواندا پەیوەندی بە حکومەتی تورکیاوە هەیە ئەویش بە راگواستنی (٣٧٠) هەزار کورد لەو ویلایەتانە بۆ ناوچەکانی تر.

بە درێژایی دەیان ساڵ گەلی کورد خەباتی چەکداری دژی چەوسێنەران بەرپاکردبوو، بە ئامانجی دان نان بە مافەکانیاندا و، لە پێناوی یەکسانی لە بوارەکانی کولتووری، ئابووری، سیاسی و بوارەکانی تری ژیان لە وڵاتدا، بەڵام لە ئەنجامی چەندین هۆکار کوردەکان بەردەوام دووچاری شکست هاتوون لە خەبات و جەنگی نابەرامبەردا. سەرکوتکردنی لە رادەبەدەر و درندانەی راپەرینی کورد، ئابووری کوردستانی تورکیا لەبەر یەك هەڵوەشاندەوە و تا رادەیەکی زۆریش هێز و توانای لەبەر کوردان بریبوو. تیرۆر و کوشتنی بە کۆمەڵ بووە هۆی شەهیدبوونی زۆر لەناوداران و کاربەدەستانی کورد و هەزارانی تر لە خەڵکی مەدەنی .لەسەروبەندی جەنگی جیهانی دووەمدا کێشەی کورد لە تورکیا هەر بە چارەسەر نەکراوی مایەوە.

چاودێریکردنی گشتی (واتە، لە سەرجەم پارێزگاکان ) تا ساڵی (١٩٤٨) دەست بەکاربوون. (٣) ساڵ پێشتر لە (٢٨) شوباتی (١٩٤٥) دا، ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری ژمارە (٢٢٢٢ -٣) دەرکرد کە بە گوێرەی ئەم بڕیارە گۆڕان بەسەر سیستێمی ساڵی (١٩٢٧) دا هات دەربارەی ئەرك و دەسەڵاتەکانی چاودێری گشتی ئەو گۆڕانکارییانە پەیوەندیان بە هەندێ ئەرك و پابەندبوون هەبوو لە لایەن چاودێری گشتییەوە و لە هەمان کاتدا پەیوەندییان بە گەشەکردنی دۆخی ناوچەکەوە هەبوو.

ساڵی (١٩٤٨) ئەو کاتەی چاودێری گشتی هەڵوەشێندرایەوە (٢٣) ویلایەت لە کۆی (٦٣) کەوتبوونە ناو هەرێمی چاودێری گشتییەوە هێشتا پێش دروستکردنی یەکەم چاودێری گشتی پارێزگاری دیاربەکر جەمال بەگ خۆی سەردانی دەرسیمی کرد بۆ ئەوەی لە بارودۆخەکە تێ بگات.

حەمدی بەگیش کە یەکێك بووە لە چاودێرە مەدەنییەکان لە دووی شوباتی (١٩٢٦) دا راپۆرتێکی بۆ وەزارەتی ناوخۆ ناردبوو کە تیایدا هاتبوو:

لە ئەنجامی چاوپێکەوتنەکان و چاودێری کردنم هەست دەکەم کە دەرسیم وردە ووردە بەرەو کوردایەتی و میسالی بوون دەڕوا و لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەم مەترسییەکان لە پەرەسەندندان.

بە پێی دەستووری (١٩٢٤) کۆماری تورکیا بریتی بووە لە (٧٤) ویلایەت، بەڵام لە (١٩٢٦) دا یاسای ژمارە (٩٧٧) بڕیاری لەسەر درا کە بە پێی ئەم یاسایە (١١) ویلایەت هەڵوەشێندرانەوە، ئەمەش وایکرد ژمارەی ویلایەتەکانی کۆماری تورکیا کەم ببێتەوە و ببێتە (٦٣). لەناو ئەو ویلایەتانەی کە هەڵوەشێندرانەوە دەرسیم، موش، ئەردەگان، گێنج، سیڤرین، ئێرگانی، ئوسکودار، بیۆگلو، گێلیبۆلۆ، چەرانجە، کۆزان بوون. لەو قۆناغەدا ژمارە قەزاکان گەیشتبوونە (٣٤٣) و ناحیەکانیش (٦٨٣) (٢٧-لا-١٨٩) .

بە قسەی سکرتێری گشتی پارتی گەلی کۆماری، وەزیری ناوخۆ شوکر قایە لە قۆناغی(١٨٧٦) وە حکومەتی تورکیا (١١) جار هێرش و پەلاماری گەورەی بردبووە سەر دەرسیم  کە ئەمەش لە ناوەرۆکدا سیاسەتی کۆماری تورکیا دەرهەق بە دەرسیم درێژەی پێدانی هەمان سیاسەتی پێشووی دەوڵەتی عوسمانی بوو.

بە گوێرەی یاسا لە چاودێریکردنی گشتی حکومەت نیزام و سیستمێکی ئامادەکردبوو بۆ دەستنیشانکردنی ئەرك و کارەکانی چاودێری گشتی، سیستمێکە لە لایەن وەزارەتی ناوخۆوە لە (٢٧) ی دیسەمبەری (١٩٢٧) ئامادەکرابوو، هەر لە هەمان ڕۆژدا ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری ژمارە (٥٨٥٨) دەرکرد.

ئەم بڕیارە دوایی لە دوو بەش پێکهاتبوو، بە گوێرەی مادەی یەکەم چاودێری گشتی دروست کرا کە ئەو ویلایەتانەی لە خۆوە گرتبوو: ئورفە، ئێلیازگ، بیتلیس، هەکاری، دیاربەکر، سیرت، ماردین، وان.دوای ماوەیەك ویلایەتی ئاگریش کەوتە ناو ئەو چاودێری گشتی یە ، ئەو کاتە موش هێشتا قەزا بوو، سەر بە بەتلیس بوو، بینگۆل و تونجەلی سەر بە ئێلیازیگ بوون لە ئەنجام دا لە کوردستان یەکەم چاودێری گشتی دروست کرا.

نزیکەی (٢٢)ساڵ ئەم چاوێرییە گشتییە حوکمی کوردستانییان کرد.

بە گوێرەی ئەم مادەیە بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران سەرۆکی چاودێری گشتی دادەمەزرێ.

مادەکانی تری ئەم نیزامە کە (١٧) مادەیە پەیوەندییان بە ئەرك و دەسەڵات و کارەکانی چاودێری گشتی و سەرۆکی چاودێری گشتییەوە هەیە. لە کاتی سەرنجدان لەو دەزگایەو لە چالاکی و سنووری کارەکانیدا دەبینن دەسەڵاتێکی ئێجگار زۆری پێدراوە.

ئەم جۆرە ڕێنماییانە بە ئاشکرا ئەوە نیشان دەدەن کە کوردستان لە ساڵی (١٩٢٧) وە بە بڕیاری جیاجیا بەڕێوە چووە. لە (١٩) ی شوباتی (١٩٣٤) دا دووەم چاودێری گشتی دروست کرا کە هەندێ لە ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای وەك چەنەکاڵی، تێکرداغ، ئەردەنێ، کیرکیارێلی بەخۆوە گرت .

لە (٦) ی ئەیلولی (١٩٣٥) دا سێیەم چاودێری گشتی دروستکرا کە بە گوێرەی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران ژمارە(٣١٩٩-٢) دەبوایە ئەم چاودێری گشتییە ئەو ویلایەتانە لە خۆوە بگرێ: ئەرزنجان، ئەرزرۆم، قارس، گوموشخانە، چۆروخ، ترابزۆن و ریزێ .

لە(٦ ) ی کانونی دووەمی (١٩٣٦) دا چوارەم چاودێری گشتی دروستکرا بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیرانی ژمارە( ٣٨٢٣- ٢)، واتە نزیکەی یەك هەفتە لە دوای دەرکردنی یاساکە لە بارەی تونجەلی، ئەمە بۆ ئەوە دروستکرا ( چارەسەری) کێشەی دەرسیم بکات. ویلایەتەکانی تونجەلی، بیگۆل، ئێلیازگ، لە یەکەم چاودێری گشتی وەدەرنرابوون.

یەکەم چاودێریکردنی گشتی ئەم ویلایەتانەی لە خۆگرتبوو: دیاربەکر، ئورفە، ماردین، سیرت، وان، هەکاری، بیتلیس، موش.

دووەم چاودێری گشتی — چەنەکاڵی، ئەدرنە، تێکرداغ، کێچ کلارێلی.

سێیەم چاودێری گشتی -ئاگری،کارس،ئەرزەروم،ریزێ،گوشخانە،چیرۆخ.

چوارەم چاودێری گشتی -تونجەلی،بینگۆی،یلمازیگ،ئەرونجان.

لە ئەنجامدا دەتوانین بڵێین لە ساڵی(١٩٢٧) ەوە (١٢) ویلایەت لەلایەن چاودێری گشتییەوە بەڕێوەبراون.

هەرچی پەیوەندی بە چالاکی و کردارەکانی تریانەوە هەیە لە ویلایەتەکانی دیکەدا ئەوا لە سالآنی( ١٩٣٥/١٩٣٤ ) دەست پێدەکەن . جگە لەمە ئەگەر بێت و باس لە یاسای پاراستنی ئارامی و ئاسایش و کردەوەکانی بکەین ، ئەوا ئەتوانین بلێین کوردستان لە نێوان سالآنی( ١٩٢٣-١٩٤٩ ) لەلایەن رژێمی تاکە حزبی چاودێری گشتییەوە بەڕێوە چووە . هەر لەم بارەیەوە پێویستە ئەوەش بگوترێ کە دووەم چاودێری گشتی لەوانیتر جیاواز بوو . لێرە رووداوەکان بەجۆرێکی تر گەشەیان کرد. زۆر گرنگە هەر لەم روانگەیەوە تەماشای یاسای ژمارە( ٢٨٦٥ ) بکەین کە لە (٢٤) ی دیسەمبەری (١٩٣٥) دا دەرچووبوو سەبارەت بە کارمەندانی یەکەم سێیەم و چوارەمی چاودێری ئەو دۆکۆمێنتانەی لە نوسینگەی چاودێرییەوە دۆزراونەتەوە وامان پیشان دەدەن کە لەچ بارودۆخێکدا ئەم چاودێرییانە دروست کراون .

بۆ نمونە: ریزەکانی یەکەم چاودێری گشتی لە( ١٩٢٧-١٩٣٥ ) بەم شێوەیە خۆیان دەنوێنن: راوێژکاری عەسکەری ، راوێژکاری یاسایی ، بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندییەکان و ئاسایش ، خزمەتگوزاری کۆچ و کۆچکردن . هەرچی پەیوەندی بە دووەم چاودێری گشتییەوە هەیە ، ئەوا ئەو نوسینگانەی بریتی بوون لە رێکخستن ، رۆشنگەری ، پاراستنی تەندروستی و خزمەتگوزاری تر . لەگەڵ ئەوەشدا لە سالّی

( ١٩٣٤) ەوە تا ئەو کاتە راگواستنی کوردەکان لە ویلایەتەکانی رۆژهەلآتەوە بۆ رۆژئاوا تا دەهات خێراتر و پتر و زۆرتر دەبوون ، بۆ نمونە لە رۆژهەلآتی فراکیا ، رۆژهەلآتی فراکیا جێگەی بەردەوامبوونی راگواستنی کوردەکان بوو . کوردێکی ئێجگار زۆر راگوێزرانە رۆژهەلآتی فراکیا ، چەندین هەنگاوی تریش نران بە مەبەستی جێبەجێکردنی سیاسەتی لە ناوبردن و تواندنەوەی کورد . پێویستیبوونی دروستکردنی چاودێرییەکی تری گشتی پەیدا بوو لە رۆژهەلآتی فراکیا ، یەکەم و دووەم چاودێری گشتی سەرۆکەکەی ئیبراهیم تالی بوو کە لە( ١٩٢٧-١٩٣٢) یەکەم بەڕێوەری چاودێری گشتی بوو . لە کاتی دامەزراندنی (ئیبراهیم تالّی بەگ) بە سەرۆکی چاودێری گشتی ، دووەم چاودێری گشتی ئەزموونی ئەویان لەبەرچاو بوو کاتی کە سەرپەرشتی یەکەم چاودێری گشتی دەکرد دەربارەی میللەت و زانیاریەکانی .

دواتر عابدین ئۆزمێن کە لە چاودێری گشتی رۆژهەڵاتی فراکیا کاری دەکرد ماوەیەکی دوور و درێژ بوو بە بەرپرسی یەکەمین چاودێری گشتی لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە راوێژکارە گرنگەکان کە لە یەکەمین چاودێری گشتی کاریان دەکرد هەر لە پۆستی خۆیان مانەوە و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژیش لە چاودێری گشتی رۆژهەڵاتی فراکیادا کاریان دەکرد .

لە جێگای جەماوەری کورد کە لە کوردستانەوە بۆ رۆژهەڵاتی فراکیا راگوێزرابوون ، کاری تایبەت ئەنجام دراوە بۆ ئەوەی لازەکانی ناوچەکانی دەریای رەش راگوێزن و لە کوردستان نیشتەجێیان بکەن . بەڵام مەبەست و ئامانجی سەرەکی حکومەتی تورکیا لە دروستکردنی چاودێری گشتی لە دەرەوەی کوردستان هەوڵدانێك بۆ شاردنەوەی سیاسەتی کۆلۆنیالیانەی تورکیا بوو لە کوردستان ( ٢٧،ل٣٨-٣٩) .

بە پێی سەرچاوە رەسمییەکان تورکیا تا حوزەیرانی (١٩٣٨ ) نزیکەی (٨٩) هەزار خێزان (٣٠٠) هەزار دۆنم لەو زەوییانەی کە مولکی دەرەبەگ و فیۆداڵەکان بوون و دەستیان بەسەردا گیرابوون بەسەریانا دابەش کران . لە سەدان هەزار جوتیاری تورکیای بێ زەوی و کەم زەوی تەنها(٤٨٤١١) زیاتر نەبوو( ١٧،ل١٢٦) .

زۆر ئاشکرایە کە بەم جۆرە کردەوانە هیچ کاتێك کێشەی زەوی لە وڵات چارەسەر ناکات . لە درێژە جێبەجێکردنی یاسایی ژمارە (٢٥١٠) ی راگواستن ، حکومەتی تورکیا فەرمانی بە دانیشتوانی کوردی چەندین پارێزگەدا بە تایبەت خەڵکی بۆتان خۆیان ئامادەکەن، بەڵام زۆربەی خەڵك ئامادە نەبوو خاکی کوردستان چۆڵ بکەن و بەجێی بێڵن بۆیە بەرە و چیا سەختەکان رۆیشتن.

لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت دەستیکرد بە بەهێزکردنی هێزە عەسکەرییەکان بۆ تەمێکردنی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات .

هاوکات (ئیبراهیم تالی بەگ) لە چاودێری گشتی لادراو(ئالپ دۆغان) بوو بە سەرۆکی چاودێری گشتی و دەسەڵاتێکی بێ سنووری پێدرا . سیاسەتی کۆنەپەرستانەی حکومەتی تورکیا بارودۆخی کوردستانی تەواو شێواند بوو . جگە لەمە، هەموو کردەوە و رەوشتەکانی حکومەتی تورکیا شایەدی ئەوە دەدەن کە مەبەستیان بوو کورد جارێکی

تر چەك هەڵگرێ و شۆرش بکات بۆ ئەوەی ئەوانیش بۆ هەتا هەتایە کۆتایی بە کێشەی کورد بهێنێت . راپەڕینی نوێی دەرسیم پێگەیشتبوو .

کەمال ئەتاتورك پێشنیازی بۆ ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا کردبوو گفتوگۆ دەربارەی کێشەی دەرسیم بکەن ، دەرگای هۆڵی پەرلەمان داخرا و کۆبونەوەکە نهێنی بوو . لە (١) ی نۆڤەمبەری (١٩٣٦) دا لە کاتی دەستپێکردنی کۆبونەوەی (ئە ب ن ت) (کەمال ئەتا تورك) لە قسەکانیدا باسی دەرسیمی کردو وتی :

گرنگترین کێشەی ناوخۆمان بریتییە لە کێشەی دەرسیم بۆیە پێویستە بە هەر نرخێك بێت ئەم دومەڵە لە رەگەوە دەربێنین و پاکیکەینەوە .

ئەم دومەڵە ترسناکە ....دەسەڵاتێکی لە رادەبەدەر بدرێتە حکومەت بۆ ئەوەی زۆر خێرا هەنگاوی پێویست بنرێ بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە .( ٢٤-لا-٥٠ ).

بڵاوبونەوەی وردە دەنگوباس لەسەر لاپەرەکانی رۆژنامە تورکییەکان شایەدی دەدەن کە لەناو کۆبونەوەکانی ئەنجومەندا باس لە بەرنامەی هێورکردنەوەی کوردەکان کرا بوو . لە کۆتایی چاپکراوەکاندا باس لەوە دەکات کە گفتوگۆکردن دەربارەی کێشەی دەرسیم تەواو بووە و جگە لەوەش حوکمی لە سێدارەدان جێگەی سزاکانی تری گرتۆتەوە .

هەر بە پێشنیازی (کەمال ئەتاتورك) دەڤەرەکانی ناوەڕاستی دەرسیم رێکخران ویلایەتێکی تایبەتییان لێ دروستکراوە ناوی دەرسیم گۆڕا بوو بە تونجەلی .

لە (٦) ی حزیرانی (١٩٣٦) دا هەرێمێك بە ناوی چوارەمین چاودێری گشتی دروست کرا، کە ویلایەتەکانی ئێلیا زیگ ، تونجەلی ، بینگۆڵی بە خۆوە گرتبوو ، واتە خاکی پێشوی دەرسیم ( ٦،لا،٦٦ ) . لە هەرێمەکەدا بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەت لە ژێر سەرکردایەتی ئالپ دۆغان دروست کرا. لەکاتی سەرکردایەتیکردنی چاودێری گشتی کە لە ئێلیازیگ بوو بەشی تایبەت دروستکران بۆ : ڕاوێژکارانی سەربازی ، گروپی جاسوسی ، فەرماندەی گشتی گروپی تایبەتی ئەفسەرەکان ، دادگەی عەسکەری ، سکرتاریەت ، بەشی دارایی و یاسای ، ژەنەڕاڵ عبدللە ئالپ دۆغان فەرمانیدا دۆخی گەمارۆ بخرێتە سەر ویلایەتەکانی تونجەڵی ، ئیلیا زیگ ، بینگۆڵ و بە هەڕەشەو سزای قورس و تۆقاندن داوای لە کوردەکان کرد (٢٠) هەزار تفەنگی پێ بدەن . هەموو ئەوانە بارو

دۆخی دەرسیمیان زیاتر ئاڵۆز و گرژ كرد و بووە هۆی سەرهەڵدان و بەرپابوونی ڕاپەڕینێكی تری نوێی چەكدارانی كوردی ، كە ئەمیش زۆر بێبەزەییانە و وەحشیانە سەركوت كرا .

لە (٥) ی تەموزی (١٩٣٩) دا ئەنجومەنی باڵای نەتەوەی توركیا یاسایەكی ، دەربارەی سنووردار كردنی هاتو چۆی كوردی پەسەند كرد، گەڕانەوەی ئەو كوردانەی قەدەغە كردبوو كە لە ناوچەكانی ڕۆژئاوا نیشتەجێكرابوون و دەیان ویست بگەڕێنەوە خاكی باب و باپیرانیان . ئەم یاسایە بۆ ئەو كەس و عەشیرەتانە بوو كە بە ڕەگەز تورك نین سەرلە نوێ دەیانەوێ لە هەرێمی ژمارە( I ) كە زیاتر ناوچە كوردییەكان دەگرێتەوە نیشتەجێ ببن .

لە (٤) ی ئایاری (١٩٣٧) دا ئەنجومەنی وەزیران بڕیارێكی بۆ ئەنجام دانی هێرشێكی سەربازی بۆ تەمبێكردنی خەڵكی تونجەڵی دەركرد. تیایدا هاتووە : ڕاپۆرتە هەواڵەكان ڕووداوەكانی ئەم دواییەی تونجەڵی كە لە چواری ئایاری (١٩٣٧) دا ڕوویاندا بوو گەیشتنە دەست (ئەتا تورك و مارشاڵ چاكماك) ، دوای لێ وردبوونەوەیان گەیشتنە ئەم ئەنجامانە :

١- هێزەكان یەك بگرن و هێرش بەرنە سەر هێڵەكانی نازمیە – كیچیكیزك (ئەشاگی بار) كارۆ گلان .

٢- ڕاگوێزانی دانیشتوانی ناوچەكانی ڕاپەڕین و نیشتەجێكردنیان لە ناوچەكانی تردا .

لە ئەنجامی ئەم ئۆپەراسیۆنەدا پێویستە هێرش بكرێتە سەر گوندەكان و خەڵكەكەشی ڕابگوازرێن . حكومەت هەموو كەرەستەو ئەسبابی تەواو بۆ ڕاگوێزانی (٢٠٠٠) لە دانیشتوانی گوندەكان ئامادە كردبوو .

لە (٧) ی كانونی یەكەمی (١٩٣٦) دا تا(٢٧) ی كانونی دووەمی (١٩٣٧) دا كۆنگرەی گشتی هەموو چاودێرییەكان بەستران ( ئەوكاتە لە وڵاتدا چوار چاودێری گشتی هەبوو ) لە ژێر سەركردایەتی وەزیری ناوخۆ شوكر قایە لە تەك چەندین كێشەو پرسی تر باس لە چۆنیەتی چارەسەركردنی كێشەی دەرسیم كرا.

لـە مـانگی تـەموزی (۱۹۳۷) دا حکومەتـەکانی عێـراق، ئێـران تورکیـا ، پەیماننامەی(سەعد ئابادیان) مۆرکرد ، بۆ ئەوەی هاوپەیمانیەتی لـە ڕۆژهـەڵاتی نزیکـدا دروست بکرێ و ببێتە داردەستی سیاسـەتی بـەریتانیا لـە ڕۆژهـەڵات نزیکـدا . لـەو هاوپەیمانیەدا تورکیا ڕۆڵی سەرکردایەتی دەبینێ و بە ڕادەیەك بەقەد بەریتانیا کاریگەری لەسەر ناوچەکە هەبوو .

دیدی هاوپەیمانیتی (سەعد ئاباد) بریتی بوو لە خەباتی هاوبەشی ئەو وڵاتانەی کـە ڕێککەوتنەکەیان مۆرکردووە بۆ دژایەتیکردنی جوڵانەوەی جیاوازخواز کە لە ناوەڕۆکـدا مەبەستیان جوڵانەوەی کوردی بوو . لەمادەی (۷) ی ئـەم هـاو پەیمانێتییـە هـاتووە :- هەریەك لە دەوڵەتانی پایەبەرزی ئەم ڕێککەوتننامەیە پابەندە بە گرتنەبەری هـەنگاوی پێویست لەلای خۆیانەوە بە مەبەستی دژایەتیکردنی هەر گروپ و دروسـتکردنی بانـدی چـەکداری یـان پـارت و ڕێکخـراو کـە ئامانجیـان هەوڵـدانبێ بـۆ تێکـدانی دامـەزراو هەڕەشەکردنە سەر ئارامی و ئاسایشی ناوچەکە بە تایبەت لەسەر سنوورەکانی وڵاتـانی مۆرکردووی ڕێکەوتننامەکە (۷ بەرگی ،۱۹ ، لا ۳۰۰-۳۰) .

حکومەتی تورکیا کاتێك پشتگیری ئێران و عێراقیان بە دەستهێنا دەستیانکرد بـە تەواوکردنی هێرش و پەلامارەکانیان دژی کوردەکانی دەرسیم .

(۱۰) ی نۆڤەمبەری (۱۹۳۷) دا دادگەی سەربازی لە (ئیلیا زیگ) . بڕیارەکانی خۆی بەسەر هەموو ئەوانەی پەیوەندییان بە کێشەی دەرسـیمەوە هـەبوو ، سـەید ڕەزاو (۱۱) یانزە کەس لـە هاوڕێکـانی حـوکمی سـێدارەیان بەسـەردا سـەپێندرا ، (۱۸) ی نۆڤەمبەر حوکمەکە جێبەجێ کرا .

(۱) ی نۆڤەمبـەری (۱۹۳۷) دا واتـە ڕۆژێـك لـە دوای بڕیـاری دادگـە بەسـەر نیشتمانپەروەرانی دەرسیمدا ، (ئەتاتورك) بە هاوڕێیەتی سەرۆك وەزیران (ج-بەیار) کـە هاتبووە جێگای (عسمەت ئینینـۆ) ، بـەناو ویلایەتـەکانی ڕۆژهـەڵاتی باشـوری وڵات گەشتێکی سازدا. ئەو سەردانی مالاتیە ، ئۆرفە دیار بەکر و ویلایەتەکانی تـری کـرد . (۱٦) ی نۆڤەمبەری (۱۹۳۷) دا لە (دیاربەکر) کە شارێکی کوردییەو دانیـشتوانەکەی کوردن (ئەتاتورك ) لە خوتبەیەکیـدا وتـی (وەك ئـەوەی دانیـشتوانی ڕۆژهـەڵاتی وڵات

تورك بن و لە توركان پێکهاتبن) وەك ئاماژە پێکردنەکەی ئەتاتورك کە خاوەنی کۆماری تورکیا بوو: تورکەکان نمونەن بۆ شارستانیەتی جیهان (١٤ .لا ١٩٦ ) بەو شێوەیە (ئەتاتورك) کە لەسالآنی (١٩١٩ - ١٩٢٠ ) باسی برایەتی تورك و کوردی دەکرد ، ئێستا پڕوپاگەندەی پان تورکیزم دەکات هەوڵی دەدا بسوونی کوردو کێشەی کورد پشتگوێ بخات .

لە مانگی ئابی (١٩٣٧) دا بە پێی پەیمانی (سەعد ئاباد)، حکومەتی تورکیا راوێژی لەگەڵ حکومەتەکانی عێراق و ئێران کرد لە بارەی هەماهەنگی و هاوکاری دژی کوردەکان و بۆ ئەوەی رێگە نەدەن جولآنەوەی نەتەوەی رزگاریخوازی کوردی تەشەنە بکات و سنوورەکانی هەرسێ وڵات بگرێتەوە .

حکومەتی تورکیا لە بەدەستهێنانی پشتگیری حوکمڕانانی عێراق و ئێران زۆر دڕندانە کەوتە گیانی شۆڕشگێڕانی دەرسیم . دەسەڵاتدارانی تورك کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە سەربازو کەرەستەی جەنگیان لەبەر دەستدا بوو زۆر بە هێزترو زیاتر بوون لە هێزە کوردییەکان ، بە هیچ جۆرێ بەزەییان بە پیرو ژن و منداڵدا نەدەهاتەوە. لە مانگەکانی سێپتەمبەرو ئۆکتۆبەری (١٩٣٨) دا دا بەرگری کوردی تێکشکێنرا و لە ئەنجامی جەنگێکی خوێناوی سەختدا هەزاران کورد لە ناوبران و تیاچوون ( ٧٦ ، ژمارە ٢ ،لا ٩ ) لە کۆتاییدا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە هەموو ئەو پرۆژە یاسایانەو کردەوانەی کە لەسالآنی بیستەکان و سییەکاندا بڕیاریان لەسەردرا بوو لە تورکیا ، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە کوردەوە هەبوو ، ئامانجی لەناوبردنی جولآنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بوو کە خەریکبوو پێدەگەیشت هەروەها تواندنەوە و ڕاگوێزانی چەندین ملیۆن کورد بوو .

# بەشی دووەم
# یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد
# دوای جەنگی جیهانیی دووەم

چ لە سالآنی جەنگ و چ لە سالآنی یەکەمی دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم، دەسەلآتدارانی تورکیا زۆر لە سەرخۆو بە وریاییەوە هەندێ هەنگاویاننا بۆ ئەوەی جولآنەوەی کوردی روونەدات. ئەوان زیاتر لە دروستبوونی کۆماری دیموکراتی کوردستان لە ئێران دەترسان، چونکە ئەمە دەبووە هۆی بەهێزبوونی جولآنەوەی رزگاریخوازانەی کورد لە کوردستانی تورکیا.

لە کۆتایی سالی( ١٩٤٥ ) و سەرەتای(١٩٤٦ ) دا دەسەلآتدارانی تورکیا دەستیان بە راگواستنی کوردەکانی نزیك سنوورەکانی عێراق و ئێران بۆ ناو قوولایی دەولەتی تورکیا کرد، بەلآم لە ئەنجامی توندوتیژبوونی بارودۆخی سیاسی ناوخۆ ناچاربوون دەست لە سیاسەتی لەناوبردنی کورد هەلبگرن، جگە لەمەش لەناو چینی بالآدەستی تورکیادا بۆچوونی تر دەربارەی کێشەی کورد پەیدابوون.

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ سیستمی فرە پارتایەتی سەری هەلدا و رۆلی جەماوەر لە ژیانی سیاسیدا پەرەی سەند. بۆیە نەدەکرا دەنگی جەماوەر لە هەلبژاردنەکاندا کە بە کام پارت دەدرێت حسابی بۆ نەکرێت. زۆربەی مەسەلەکان پەیوەندییان بەوەوە هەبوو داخوا کام پارتی بۆرژوا زۆرینەی دەنگ بە دەست دێنێ. لەناو دەنگدەراندا لەوانە کوردەکانیش لە سیستمی فرە پارتایەتی نوێی تورکیادا کەوتبوونە دەست شێخ و ئاغا کوردەکان، ئەم هۆکارە تەواو دەرەبەگی کورد و تورکی لە یەکتر نزیك کردەوە و پەیوەندیان بە بەرەی یەکگرتووی تورکیاوە کرد دژی هەر جۆرە ریفۆرمێکی کشتوکالی، لە راستیشدا تەعبیریان لە بەرژەوەندی دەرەبەگە کوردەکان دەکرد، دەتوانین

لێرەدا هەندێك شتی سەیر كە لە ساڵی (١٩٤٥) دا بە رێكەوت روویداوە باس بكەین، ئەویش لە كاتی لێدوانی ناو بەرەی یەكگرتووی توركیا كە دەربارەی ریفۆرمی كشتوكاڵە. كەسێكی وەك جاویت ئۆرال كە خاوەن زەوی و موڵكدارێكی گەورە بوو، عدنان مێندرێس، ئێمین سازاك و چەندین دەرەبەگی تری گەورەی تورك و كورد بە یەكەوە وتووێژیان لە دژی ریفۆرمی زەوی كردووە. ئەمین سازاك روی لە شەوكەت رەشید خاتیپۆگلو كرد كە مناقەشەی پرۆژە یاساكەی ریفۆرمی دەركرد ووتی: ئەم پرۆژەیە بكشێنەوە من (٣٠) هەزار دۆنمتان دەدەمێ لە ناوچەی بێلێكۆپرۆ. خاتیپۆگلو پرسی: ئەدی ئەگەر بە یاسا ئەو زەوییەت لێ بسەنین؟ (ئەمین لە وەڵامدا ووتی: ئەگەر دەوڵەت بە زۆر ئەم زەوییەم لێ بسەنێ، ئەوا ئەمین سازاك لە ناوچەی ئاسكی شەهر ناژی). لە راستیدا گرتنەبەری سیستمی فرە پارتایەتی بووە هۆی كاریگەرتر بوونی دەسەڵاتی شێخ و ئاغا و نوێنەرەكانی تری چینە بەرچاوەكانی كورد. یەكەم: سیستمی نوێی هەڵبژاردن بایەخی دەنگدەرانی بەرزتركردەوە، لەوانە ئەو كوردانەی كە زۆر بە توندی لە بوارەكانی ئابووری و ئاینیدا بە شێخ و ئاغاو سەرۆك عەشیرەتەكان بەستزابوونەوە. لێرەدا وا دەردەكەوێ كە چینی باڵادەستی كوردی ببووە سەرچاوەی دابینكردنی دەنگ بۆ چینی باڵادەستی تورك و، پارتە سیاسییەكان و لەگەڵ ئەوەشدا بوو بە فاكتەرێكی سیاسیی بەهێزی ململانێ لەسەر دەسەڵات. دەنگدەرانی كوردیش دەنگیان بەو كاندیدانە دەدا كە پێشتر لە لایەن چینە باڵادەستەكان بۆیان دەستنیشان كرابوون.

دووەم — بۆرژوای تورك كە دەست لەسەر سنگ بەرامبەر ئاغا و دەرەبەگی كورد وەستابوو هێندەی تر ئەو ئاغا و دەرەبەگانە پلە و پایەیان لەناو قەوم و قیلەی خۆیاندا بەرزتر ببۆوە و كاریگەری شێخ و ئاغا و سەرۆك عەشیرەتەكان بەسەر خەڵكی بەرفراوانی كوردەوە بەرەو زیادبوون دەچوو.

ئەم جۆرە وەرچەرخانە بەرەو سیستێمی فرە پارتایەتی نزیكبوونەوەیەكی لەگەڵ خۆی هێنا لە نێوان چینە دەوڵەمەندەكانی كورد و چینی باڵادەستی توركدا. لە ئەنجامی (یاریكردن بە دیموكراسی) كوردە دەرەبەگەكان سەربەخۆیانە و بەبێ لەبەرچاوگرتنی

پەیوەندیەکانییان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ناوەندیدا، وردە وردە هاوکارییان لەگەڵ نوێنەرانی چینی باڵادەستی تورکدا دەکرد کە ئەوانیش بۆرژوا و دەرەبەگەکان بوون. ئەمانە بە خشکەیی لەو شارانەدا نیشتەجێبوون کە نزیك بوون لە بازرگانی، پرۆسەی دراو، هەروەها توانییان چەندین لقی جیاجیای کشتوکاڵی بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، لە هەمان کاتدا زەوییەکانی خۆیشیان لە دەست نەدا. لە تەك ئەمانە و چینی باڵادەستی کوردی دەستی لە سیاسەت وەردەدا، بە پێی فەرمانەکانی پارتی دەسەڵاتدار ئەوانیش بەشدارییان لە شارەوانی و کۆبونەوەی گشتی ویلایەتەکاندا دەکرد.

بەم شێوەیە و دوابەدوای ئەمە خەباتی پارتە سیاسییە بۆرژواکان بە مەبەستی بەدەستهێنانی دەنگی دەنگدەران و دەسەڵات گرتنەدەست تا رادەیەکی زۆر رێوشوێنی سیاسی شێخ و ئاغای کوردی گەورەتر کرد، چونکە چارەنووسی کاندیدەکانی پەرلەمان بە زۆری بەسترابوونەوە بەمانەوە.

## ئەنجومەنی باڵای تورکیا:

حکومەتی پارتی گەلی- کۆماری هەندێ هەنگاوی نا تا کوردەکان بە لای خۆیدا رابکێشێ کە دەکرێ لەم جۆرە هەنگاونانەی پارتی گەلی کۆماری دەسەڵاتداردا جۆرە تەفسیرێکی بۆ بکرێ. لە ساڵی (١٩٤٧) دا سەرۆك وەزیران رایگەیاند کە ئێستە دەکرێ کوردەکان بۆ سوپا بانگهێشت بکرێن و بە یەکسانی لەگەڵ تورکەکاندا (٣١. ٣٤). وەك دیارە پێش ئەم بڕیارە کوردەکان تەنها بۆ هەندێ بەشی هاوکاری بەکاردەهێنران لە هەمان کاتدا لە (٨) ی حزیرانی (١٩٤٧) دا پەرلەمانی تورکیا قانونی ژمارە (N.١٥١٠) دەرکرد کە جەختی دەکردەوە سەر هەندێ لە بڕگەکانی یاسای نیشتەجێکردن (التوزیع السکانی) ژمارە (١٥١٠) کە لە (١٩٣٤) دا بە گوێرەی مادەی کاتی ژمارە (١) دەرچووبوو .(٧ب ٢٨ لا١٣٢٢-١٣٢٤) .

بە گوێرەی مادەی کاتی ژمارە (١)، هەموو سنووردارکردنێکی کاتی لە مافەکانی ئەو کەسانەی بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران و لە بارودۆخێکی ناچاریدا راگوێزرابوون بۆ ناوچە دیاریکراوەکان تا بەر لە دەرچوونی ئەم یاسایە هەڵوەشێندرانەوە. بەڵام لە

یاساکەدا هاتووە کە ڕێگەیان پێنەدراوە تێکـەڵاوی ناوچـە قەدەغـەکراوەکان بـن، وەك: ئاگری و ساسونێ و تونجەلی و زیلایانێ. لە هەمان کاتدا دوای بڵاوکردنەوەی ئەم یاسایە و بە ڕێگەپێدانی حکومەت لە ماوەی ساڵێکدا ئەو کەسانەی کـە پێـشتر ڕاگوێزرابـوون دەتوانن بگەڕێنەوە ویلایەتەکەی خۆیان یان ویلایەتێکی تری دراوسێی خۆیـان (مـادەی کاتی ٢) بەڵام لە بری ئەمە هەموو موڵکە جێگیرەکان لە لایـەن حکومەتـەوە دەسـتی بەسەرداگیرابوو.

بە گوێرەی یاسای ژمارە (٥٠٩٨ )کە لـە (٥) ی شـوباتی (١٩٤٨) دا دەرچـووبوو ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری ژمارە (٣١٦٩٩٢) ی دەرکرد کە گەواهی ئەوە دەدەن سەرانی تورك لەگەڵ ئەوەی کە کەمێك گوێڕایەڵی ئاغا و دەرەبەگی کورد بوون، بـەڵام هـەرگیز وازیان لە سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەی کورد نەهێناوە وەك لە بڕگەی (B) ئەم بڕیارەدا هاتووە ئەو کۆچەرانەی بە ڕەگەز تورك نین و بە زمانی تورکی قسە دەکەن لـەو ناوچـانە نیشتەجێ دەکرێن بە شێوەیەك هەر خێزانەو لەناو گوندێکی تورکیدابێ و نابێ ژمارەیـان (١٠%) ی ژمارەی تـورکی گونـدەکان زیـاتر ببـێ (٣٥- لا- ١٣٣) . دواتـر کـورد و کۆچەرەکانی تر کە تورك نەبوون بۆیان نەبوو گەڕەك بۆ خۆیان دروست بکەن، هەرچـەندە ئەم بڕیارە دژی سیاسەتی تواندنەوەی حکومەتی تورکیا بوو. ئەم کارو کردارانـە دوایـین ئەڵقەی چالاکییەکانی ناو پلان و بەرنامەی چارەسەرکردنی کێشەی کورد بوو لـە لایـەن پارتی گەلی کۆمارییەوە کە لە ماوەی (٢٧) ساڵی حوکمڕانی خۆیدا. تـەواوی مێـژووی حوکمڕانیکردنی پارتی گەلی کۆماری گەواهی لە سیاسەتی فاشیلانەیان دەدەن دەربارەی کێشەی کورد. دواتر هەندێ سیاسەتمەدارانی تورك ناچار بوون دان بەو ڕاستییەدا بنێن.

بە درێژایی ساڵانی حوکمڕانیکردنیدا عیسمەت ئینینۆ (چ وەك سەرۆك وەزیران و چ وەك سـەرۆك کۆمـار)تەماشـای کێـشەی ویلایەتـەکانی ڕۆژهـەڵاتی نـەکردووە وەك کێشەیەکی نیشتمانی. چارەسەرکردنی کێشەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات لـە چوارچـێوەی کاری ئیداری و عەسکەریدا..... بێهیوایی و تاریکی دروست کرد.

ئازارەکانی ڕۆژهەڵات گەلێ لەوە قووڵتر و زیاتر بوون کە چاودێران هەستیان پێدەکرد (٢٠، لا، ٣٢٦) سیاسەتی دوو فاقەی پارتی گەلی کۆماری دەرهەق بە کێشەی

کورد لە لایەك (راکێشانی ئاغا و دەرەبەگی کورد بە لای خۆیدا) و لە لایـەکی تـر درێژەپێدانی سیاسـەتی تواندنـەوەی کـورد بـووە هـۆی لاوازکردنـی هەڵوێـستی حزبـی باڵادەست و بەهێزکردنی کاریگەری پارتی دیموکراتی ئۆپۆزسـیۆن (بەرهەڵـستکار) لـەو ویلایەتانەی کە زۆربەی دانیشتوانەکانی کورد بوون.

لە ئەنجامدا لە سـاڵی(١٩٥٠) لـە کـاتی هەڵبژاردنـەکانی ئەنجومەنـدا کوردەکـان دەنگیان بە حزبی دیموکراتدا (حزبەکەی ج- بەیار و ع. مەندێریس). کاندیدی ئەم حیزبە لە کاتی پرۆسەی هەڵبژاردندا لە ویلایەتـەکانی رۆژهەڵاتـدا لـە وتەیەکیـدا بـەڵێنی بـە کوردەکاندا کە مافی یەکسانییان لەگەڵ تورکەکاندا پێبدات و گەشـە بـە ئـابووری ئـەو ناوچانە بدات کە دانیشتوانەکەیان کوردن، بەڵام رووداوەکانی دواتـر دەریـان خـست کـە هەموو ئەو بەڵێن و قسە زل و فشۆڵانە قسەی بێ بنەمای پێش هەڵبژاردن زێـتر هیـچی دیکە نـەبوون. لـەم بارەیـەوە( عیـسمت شـریف وانلـی) دەنووسـێ: (کۆمارییـەکان و دیموکراتەکان ) بۆ کورد بریتین لە زاڵبوونی بۆرژوای (راسیـستی) رەگەزپەرسـت. ئەمـە سەرکوتکردنی نەتەوەییە، ئەمانە بریتین لە ئیدارەیـەکی گەنـدەڵی تـورکی، بـریتین لـە تیرۆری پۆلیس و سوپا، ئەم هەژارییە ، بچوکترین مافی سەرەتایی کوردی تیا نیـە .... بریتین لە فاشیزم، هەموو ئەو بەڵێنانەی کە بە فـەرمی دەدران. (٤٠، ١٩٦٠، لا، ١٦) دەربارەی هەڵوێستی پارتە سیاسییەکان لەسەر پرسی کوردی دوای حوکم گرتنە دەسـتی حزبی دیموکرات، ئادیێر دەنوسێ: کاریگەری لەسەر دەنگدەرانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی وڵات و توانای بەکارهێنانی دەسەڵاتی ئاغا و شێخەکان ناوچەیەکی بابـەتی ململانێکـە بوو هەروەها (بازرگانی و- قاچاغچیەتی بوو لە نێوان پارتی دەسەڵاتدار و ئۆپۆزسیۆندا) (٢٠. لا. ٣٢٧) .

دواتر کە حزبی دیموکرات دەسەڵاتی گرتە دەست هـیچ گۆڕانکارییـەکی بەرچـاو لـە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا رووی نەدا . لە (٣٠) ی ئابی (١٩٥١) دا حکومـەتی پـارتی دیموکرات لە رێگەی (ئە ب ن ت) بڕیاری یاسای ژمارە (٥٨٢٦) دا لە بارەی گۆڕانـدنی مادەی(١٢) یاسای ژمارە (٥٠٩٨). ئەم مادە نوێیە بەم شێوەیە:

بە بێ ڕێگەپێدانی ئەنجومەنی وەزیران (هیچ کەس جگە لە بەرپرسانی سوپاو پۆلیس) ڕێگەی پێ نەدراوە بچێتە ناوچە قەدەغەکراوەکان، ئەو ناوچانەی لە ڕۆژهەڵاتەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە هێڵی بە یەکگەیشتنی خاڵەکانی ئیلجیێ ویلایەتی قارس – تۆکاتلی- سەردار بولاق- قەرەنیەرەق- شێخیرگردن- یوکارینچۆ(ویلایەتی ئاگری) هەروەها ئاراراتی بچوك (٣٥، لا، ١١٤) . بە پێی یاسای ژمارە (٥٨٢٦)، لیژنەیەك لە سێ کەس دروست دەکرێ (لە نوێنەرانی وەزارەتی کشتوکاڵ، هاتوچۆ و گەیاندن، تەندروستی، دابینکردنی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی)، دەبوایە ئەو لیژنەیە ناوچەیەك دەستنیشان بکات کە رزگاری بووە لە ناوچە قەدەغەکراوەکان، بۆ نمونە (تونجەلی، ساسۆن، زێیلان،.......هتد). دەبوو بە پێی پێویست و بە گوێرەی توانا ئاوەدان بکرێنەوە. بە گوێرەی ئەم یاسایە و لەو ناوچە ئازادکراوانەدا، دەکرێ ئەو کەسانەی تێیدا بژین کە لە لایەنی ئیدارییەوە دەرکراون بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا لە دوای یەکی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٣٨)ەوە، واتە دوای ئۆپەراسیۆنی تەمبێکردن لە لایەن سوپای تورکەوە لە دەرسیم.

بە گوێرەی یاسای ژمارە (٥٨٢٦) لقی شەشەمی بەڕێوەبەرایەتی گشتی بۆ کاروباری کشتوکاڵی و ئاوەدانکردنەوەی سەر بە سەرۆك وەزیران لە (١٧) ی ئۆکتۆبەری (١٩٥١) دا بە ئیمزای وەزیری دەوڵەت ئیشبان نووسراوی ژمارە (١٥٤) ی بۆ پارێزگەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات نارد. لەم نوسراوەدا ئاماژە بەوە دەکات کە یاسای ژمارە (٥٨٢٦) لە (٣) ی ئابی (١٩٥١) دا ئەو بڕیارە هەڵدەوەشێنێتەوە کە دەڵێ: سەفەرکردن بۆ ناوچەکانی تونجەلی، ساسۆن، زێیلان، ئاگری(تەنها هەندێ ناوچەی بچوك نەبێ کە هاتووچۆی تێدا هێشتا قەدەغەیە) لە هەمان کاتدا بە نووسراوی وەزیری ژمارە(٣٦٣٠- ١٠٥) پارێزگەرانی ویلایەتەکانی ئاگری، بیتلیس، قارس، سیرت، تونجەلی، وان ئاگادارکرانەوە لە بارەی پێکهێنانی ئەو لیژنەیەی کە پێشتر باسمان لێوەکرد. (٣٥، لاپەرە، ٣٣٥) .

ئەمە ئەو بەڵێن و کارە تایبەتییانە بوو کە حزبی دیموکرات لە پێش هەڵبژاردندا بە خەڵکیدا بوو. خۆ ئەوەی پەیوەندیشی بە بەڵێنەکانی ترەوە هەیە، ئەوا هیچ کات

جێبەجێنەکران، لەوەش بترازێ حکومەتی حزبی دیموکرات هەنگاوی زیاتری بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ وڵاتانی عێراق و ئێراندا نا بە مەبەستی سەرکوتکردنی ئەگەری سەرهەڵدانی جوڵانەوەی کوردی. ئەمە وەڵامدانەوەیەك بوو بۆ بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیا و چەند وڵاتێکی تری زلهێزی رۆژئاوا، کەهەولیان دەدا هاوپەیمانیەتێکی تری سەربازی لە شێوەی ناتۆ دروست بکەن کە وڵاتانی رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست لە خۆبگرێ:

تورکیا وەك وڵاتێکی زۆر نزیك لە ئینگلتەرا و ئەمریکا ئەرکی راستەوخۆی جێبەجێکردنی پلانی وڵاتانی رۆژئاوای گرتە ئەستۆ بە مەبەستی دروستکردنی ئەو هاوپەیمانییە.لە(٢٤) ی شوباتی (١٩٥٥) دا لە شاری بەغداد لە نێوان عێراق و تورکیا رێککەوتننامەی هاوکاری مۆرکرا، دواتر ئەم رێککەوتننامەیە بە هاوپەیمانییەتی بەغداد ناسرا. بە گوێرەی مادەی یەکەمی ئەم هاوپەیمانێتییە دەکرێ پرۆتۆکۆڵ و رێککەوتننامەی تایبەت مۆر بکەن دەربارەی هاوکاریکردنی هەردوولا دژی جوڵانەوەی پەرەسەندووی دیموکراسی و لەوانە دژی خەباتی کوردەکان لە پێناوی مافی نەتەوەییاندا.

لە ئازاری (١٩٥٥) دا رۆژنامەی (تێلێگرافی) لوبنانی هەواڵی مۆرکردنی پرۆتۆکۆلێکی نهێنی بلاوکردبووەوە لە نێوان عێراق و تورکیادا کە هەردووك بۆیان هەیە لە کاتی پێویستدا فڕۆکەخانەی عەسکەری خاکی یەکتر بۆ پرسی سەربازی بەکاربێنن. یەکێك لە خاڵەکانی پرۆتۆکۆلەکە بریتیبوو لە بەهێزکردنی هاوکاری و هەماهەنگی بۆ دژایەتیکردنی تاقم و گروپی لابەلا کە لە دژی سیاسەتی عێراق و تورکیا کاردەکەن ( ١٨ لاپەرە ١٦ ). تا کۆتایی ساڵی (١٩٥٥) دا وڵاتانی ئینگلتەرا و پاکستان و ئێرانیش بوون بە ئەندامی ئەو هاوپەیمانیتییە.

دوای بەستنی کۆنگرەی دامەزراندنی هاوپەیمانێتی بەغداد کە لە نۆڤەمبەری (١٩٥٥) دا بەسترا لە بەغداد ستروکتوور( هەیکەلی تەنزیی) ئەم هاوپەیمانێتییە پەسەندکرا کە بۆ ئەو مەبەستە ئەنجومەنێکی وەزیرانی بەردەوامی بۆ دانرا لەگەڵ سکرتاریەت و چوارکۆمیتە بۆ چارەسەرکردنی کێشە جیاجیاکان . ئەوەی بەلای ئێمەوە

سەرنج راکێشە (کۆمیتەی ئاسایشی و کۆمیتەی پۆلیس ) کە کۆمیتەی چالاکی تێکدەرانەیە.

ئەم کۆمیتەیە تەزکیەو ئامۆژگارییەکانی ئەنجومەنی وەزیرانی سەبارەت بە هەنگاونان و کاری پێویستی ئامادەکرد بۆ دژایەتیکردنی بزووتنەوە دیموکراسییەکان و جولانەوەی رزگاری خوازی نەتەوەیی کورد لەناو ولاتانی ئەندام لەم هاوپەیمانیەتییەدا، هەروەها لەو ولاتانەشدا کە هەلوێستی بێلایەنەیان هەیە و دراوسێی یەکترن .لە لێکدانەوەی ئەو بابەتانەی سەرەوەدا دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە لەکاتی بەستنی هاوپەیمانێتیی بەغدادا ئەوانە هەستیان بە پەرەسەندنی کێشەی کورد کردبوو بەردەوام حکومەتەکانی ئێران - عێراق - تورکیای دووچاری نائارامی کردبوو . (عیسمەت شریف ) وانلی کە سیاسەتمەدار و رۆشنبیرێکی کوردەو بۆ جولانەوەی کوردی خەبات دەکات چەندین نامەیان ئاراستەی( UN) نەتەوەیەکگرتووەکان کردووە سەبارەت بە پەیماننامەی بەغداد کە ئەو هاوپەیمانێتییە خەسلەتی دژە کوردی هەیە . هەر لەو بارەیەوە( عیسمەت شریف ) نوسیبووی : دەتوانم باوەڕتان پێ بهێنم کە بوونی کێشەی کورد تاکە هۆکاری سەرەکییە لە دروست بوونی هاوپەیمانێتی بەغداد لە نێوان تورکیا و ئێران و حکومەتی پادشایەتی (نوری سعید) دا، هەموو ئەمانە بە مەبەستی لە نێوبردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی نەتەوەیی کورد یەکیان گرتەوە . هەروەها ئینگلتەراش دژی کورد خەبات دەکات .... ئەو دەیەوێ و هەوڵ دەدات رەوشی هەنوکەیی بپارێزێ بۆ ئەوەی بە سەرکەوتووی نەوتی ناوچەکە بە تالان ببات ، لەگەڵ ئەوەشدا گەلی کورد بۆتە قوربانی سەرەکی ئەو سیاسەتەی رەوشی هەنوکەییە لە رۆژهەلاتی نزیکداو ئەم راستییەش هیچ بەلگە و شاهیدی ناوێ ( ٤٧ ، ١٩٩٦ ، لا ، ٢٥ ) .

لە(١٤) ی تەموزی (١٩٥٨) دا رووخانی رژێمی پادشایەتی لە عێراق و دەرچوونییان لە هاوپەیمانێتی بەغداد گورزێکی کوشندە بوو درا لە سیاسەتی شۆڤێنانەی کۆنەپەرستانی ولاتانی تورکیا و ئێران و عێراق، لە ئەنجامی ئەو کودەتایە بارودۆخێکی لەبار بۆ کوردەکان رەخسا بۆ درێژە پێدان بە خەبات لە پێناوی بەدیهێنانی مافە

نەتەوەییەکانیاندا . بەڵام بارودۆخی کوردەکان لە تورکیا هەروەك پێشوو مایەوە .چونکە حکومەتی حزبی دیموکرات بەردەوام بوو لە سەرکوتکردنی جوڵانەوەی دیموکراسی و بەرزبوونەوەی هەر جۆرە دەنگێکی نارەزایی لەناو کوردەکانی تورکیادا .

لە (١٧) ی دیسەمبەری(١٩٥٩) دا حکومەتی تورکیا (٤٩) رۆشنبیری کوردی زیندانی کرد، لەوانە نوێنەری خوێندکارانی زانکۆ. ئەگەرچی گرتنەکە ئەوپەڕی نهێنی و دڕندانە بوو، لە هەمان کاتدا رێگە بە رۆژنامەکانیش نەدرا وەك هەواڵ بڵاوی بکەنەوە، بەڵام گرتنی نوێنەرانی رۆشنبیرانی کورد چ لە کوردستان و چ لە دەرەوەی وڵات بە توندی مەحکوم کرا.

حکومەتی تورکیا بەردەوام هەوڵی دەدا ئەو زوڵم و زۆرداری و توندوتیژییانەیان لە ماسمیدیاکاندا بە جۆرێکی تر روون بکەنەوە. سەرۆك کۆمار (ج- بەیار) و وەزیری ناوخۆ نامیق غیدیق رایان گەیاند کە: هاونیشتمانانی کورد لەسەر (چالاکی کۆمۆنیستی) گیراون کە بە پێی یاسای وڵات قەدەغە کراوە.

حکومەتی تورکیا بە هیچ جۆرێ گوێ بە داواکارییەکانی خەڵکی نەدەدا، بەردەوامیش بوو لەسەر درێژە پێدانی سیاسەتی ناوخۆی دژ بە بەرژەوەندییەکانی گەل، هەر ئەمەش بووە هۆی گرژبوونی بارودۆخی سیاسی لە وڵاتدا. کە لە ئەنجامدا (٢٧) ی ئایاری(١٩٦٠) کودەتای دەوڵەتی لە تورکیا روویدا، کۆمەڵێك ئەفسەر و جەنەراڵی پایە بەرزی سوپا لە کۆمیتەیەکدا بە ناوی کۆمیتەی یەکێتی نەتەوەیی (ك.ی.ن) یەکییان گرتبوو ئەو کودەتایەیان ئەنجامدا و دواتر تەواوی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی جێبەجێکردن کەوتە دەست ئەم کۆمیتەیە. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم کودەتایە بە قسەی ئەندامانی کۆمیتەکە بریتی بوو لە (کێشەی کوردی) کە بە ئاشکرا هەڕەشەی لە یەکپارچەیی خاکی تورکیا دەکرد. (٣٣، لا، ٢٧٠) .

کودەتای عەسکەری کە لە (٢٧) ئایاری (١٩٦٠) دا ئەنجامدرا، ئاواتەکانی کۆمەڵە پێشکەوتووخوازەکان و هێزە دیموکراتییەکانی کوردستانی تورکیای نەهێنایەدی. راستە لە دوای کودەتاکە زۆر لە زیندانییەکان ئازادکران، بەڵام نوێنەرانی رۆشنبیری کورد کە

تاوانبارکرابوون بەو (کاروچالاکی) یانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی نەتەوەیی تورکیادا ناکۆك بوون هەر لە زینداندا مانەوە.

حکومەتی نویٚ کۆتایی بە هەموو ئەو کار و چالاکییانە هێنا کە (دژی دەوڵەت بوون) و هەوڵی زۆریشی بۆ ئەوە بوو کوردەکان لەو چالاکییانە دابڕیٚ کە مەبەستیان بوو وڵات پارچە پارچە بکەن حکومەتی سەربازی نویٚ دەستیان کرد بە ڕەشبگیری کوردەکان. لە یەکی حزیرانی (١٩٦٠) دا زیاتر لە (٤٨٥) کوردیان گرت و لە سیواس لە سەربازگەیەکی تایبەتی زیندانییان کردن (٢٧، لا، ٣٢٨) .

لە مانگی ئەیلولدا ئەندامی کۆمیتەی یەکێتی نەتەوەیی ئەفسەری دەرەجەدار کوچوك، لە ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٦٠) دا وەزیری ناوخۆی حکومەتی کاتی جەنەڕاڵ ( قزل ئۆغلۆ ) بۆ چاودێری و چاوگێڕان بە ناوچەکە سەردانی شارە کوردەکانیان کرد. دوای ئەمە راپۆرتێکیان پێشکەش بە کۆمیتەی یەکێتی نەتەوەیی کرد کە تیایدا هاتبوو وەك ئەوەی کوردەکانی شارەکانی رۆژهەڵات بە نهێنی رێککەوتنێکیان لەگەڵ کوردەکانی ئێران و عێراق و سوریا کردبیٚ بۆ ئەوەی کۆماری کوردی دروست بکەن (٦١، ١٩٦١، ژمارە٧- ٨، لا،٤٠) .

لە(١٧) ئۆکتۆبەری (١٩٦٠) دا کۆمیتەی یەکێتی نەتەوەیی یاسایەکی بۆ یاسای ژمارە (٢٥١٠) لە بارەی (نیشتەجێکردن و راگواستن) زیادکرد، ئەویش یاسای ژمارە (١٠٥) بوو. بە گوێرەی ئەم یاسایە لە بەرژەوەندی حکومەتدا نەبوو ئەو کوردانەی پێشتر راگوێزرابوون رێگەیان پیٚ بدریٚ بگەڕێنەوە شوێنی باب و باپیرانیان لە تونجەلی . لە یاساکەدا هاتووە:

هەر کەسێك هەستی ئاینی بەکاربێنیٚ، نەریت یان ئایدۆلۆجیای بێگانە، هێز یان توانای خۆی بۆ کارکردنە سەر خەڵك بەکاربێنیٚ ، یان بۆ تۆقاندنی خەڵك، هەروەها

هەوڵی شێواندنی ئەو ناوچانە بدات کە تێیدا دەژی، یان کارو چالاکی وا ئەنجام بدات دژ بە بەرژەوەندی نەتەوەیی بێت، دەکریٚ بە بڕیاری وەزارەتی ناوخۆ و ئەنجومەنی وەزیران دووربخرێتەوە بۆ هەر ناوچەیەکی وڵات بیٚ ئەوەی مافی گەڕانەوەی هەبیٚ بۆ شارەکەی خۆی یان شوێنەکەی خۆی(مادەی I) (٢٧،لا، ٣٣٣).هاوپێچ لەگەڵ ئەم یاسایەدا

وەزارەتی ناوخۆ نوسراوێکی ئاراستەی پارێزگاکان و ویلایەتەکانی رۆژهەلات کردو داوای لێکردبوون ناوی ئەو کەسانەی بۆ بنێرن کە کاری تێکدەرانە ئەنجام دەدەن.

بە رەسمی لە لایەن حکومەتەوە راگەیەندرا کە، یاسای ژمارە (١٠٥) بۆ ئەوە بڕیاری لەسەر دراوە تا کۆمەڵێك ریفۆرم ئەنجام بدات وەك: لەناوبردنی پاشماوەی نەریتی سەدەکانی ناوەڕاست لە تورکیا، لەناوبردنی دامەزراوەکانی شێخ و ئاغا، نمایشکردنی هێزی دەوڵەت، نەهێشتن و کەمکردنەوەی چەوساندنەوە و زوڵم لەسەر هاوولاتییان (٧، ٢٢، ١٩٦٠) حکومەتی کاتی قزل ئۆغلو (مشورخواردنی هاوولاتیان) کە بە مەهزەلەیەکی تری وەزیری ناوخۆی دانا، سەرکەوتوانە وتی:

(ئێستە ئیتر نە شێخ هەیە، نە ئاغانە سەرۆك عەشیرەت.... من ئەم قسانەم لەگەڵ شێخە، ئەم خەڵکە نازانن موسوڵمانیەتی چییە. ئەمانە شێخ نین بەڵکو دەسیسەن، خەڵك هۆشیار نیە، لە ئیسلامدا کەس ناتوانێ ببێ بە ناوبژیوان لە نێوان خودا و کۆیلەکانی. تەنها لای مەسیحییەکان ئەمە دەکرێ. هاوولاتی نابێ ببێتە داردەستی ئەو ناوبژیوانانە. حکومەتی شۆڕشگێڕی لە دژی ئەوان هەنگاوی توندو تۆڵ دەنێ). (٧٤، ٢٢، لا، ١٩٦٠) .حکومەتی گورسێل ك.ی.ن بڕیاریان داوە زۆر بە جدی ئەو کارانە ئەنجام بدەن.

بە پێی یاسای ژمارە (١٠٥) لە مانگی دیسەمبەری (١٩٦١) دا بۆ رۆژئاوای ولات بۆ شارەکانی (ئەنتالیا، بوردور، ئیزمیر، موگلا، ئافۆن، سپارتە، چۆروم، دێنزیلی) (٥٥) کوردی بە توانا و لێهاتویان لە زیندانی سیواس کە کوردێکی زۆری تیا ئاخنرابوو دوورخرانەوە . گرنگە ئەوەش بڵێین کە کوردێکی زۆر لەوانەی رادەگوێزران و دووردەخرانەوە هیچ پەیوەندیەکییان بە شێخ و ئاغاوە نەبوو. ئەوانە تەنها کوردی نیشتمان پەروەر و بە تواناو لێهاتووبوون و کاریگەرییان بەسەر خەڵکی کوردستانەوە

هەبوو. (٢٦، ٣٣٥، ٣٣٦). لەو کوردانەی دوورخرابونەوە (٥٤) کەسیان ئەندامی حیزبی دیموکرات بوون و یەکێکیان ئەندامی پارتی گەلی کۆماری بوو. ئەم بەڵگەیە شایەدی ئەوە دەدا کە:

یەکەم: لە سەردەمی حکومڕانی حزبی دیموکراتدا ئاغاکانی کورد رۆڵی گرنگیان هەبووە، هەروەها تێکەڵاوییان لەگەڵ پارت و گروپی سیاسی جیاجیادا هەبووە.

دووەم: دوورخستنەوەی رۆشنبیر و کەسانی بە توانـاو لێهاتووی کورد، ئامانجی سیاسی لە پشتەوە بوو نەك کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی. پارتی گەلی کۆماری کە زۆربەیان لە کۆمیتەی یەکێتی نەتەوەیی بوون ئەو کارەیان بۆیە دەکرد نەك هەر بۆ ئەوەی جوڵانەوەی کوردی لە سەرکردەکانیان دابڕێنن بەڵکو بۆ ئەوەش بوو گورزێك لە کاریگەرییەکانی حزبی دیموکراتیش بدەن لە ناوچە کوردییەکاندا.

لە (٢٧) ی ئۆکتۆبەری (١٩٦٠) دا ك. ی. ن یاسای ژمارە (١١٤) ی پەسەندکرد، بە گوێرەی ئەم یاسایە لە زانکۆکانی وڵات (١٤٧) پرۆفیسۆر و مامۆستا لە کار دەرکران و بەوە تاوانبارکرابوون کە کار بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکەن (١٩٦١،٦١، ژ،٧-٨ ، لا، ٤٠) .لە ساڵی (١٩٦١) دا لە دادگەی عەسکەری — سیاسی ئەنقەرە پرۆسەی دادگەییکردنی (٤٩) کورد بەڕێوەچوو کە پێشتر لە سەردەمی حکومەتی مەندەرێس لە نۆڤەمبەری (١٩٥٩) دا گیرابوون. دادگە کارەکانی بە نهێنی و دەرگا داخراوی بەڕێوەبرد، لەناو تاوانبارکراوەکاندا کەسانی بەڵێندەر، پارێزەر، ئەفسەر، دکتۆر، خوێندکاری زانکۆ هەبوون. ئەوان بەوە تاوانبار کرابوون کە مەبەستیان بووە یەکپارچەیی خاکی وڵات تێکدەن. تاوانبارکراوەکان دەبوایە حوکمەکەیان زیندانی بێت لە ماوەی (٨ بۆ ١٥) ساڵ. (٦١، ١٩٦١، ژ، ٧-٨، لا، ٤٠) .لەناو ئەو (٤٩) کەسەدا رۆژنامەنووس (عبدالرحمن دۆلاق )بوو کە لە دیاربەکر رۆژنامەی (ئیلیر- یورت) ی دەردەکرد. ئەو بە (١٧) کەتن تاوانبار کرابوو. دواتر بە هەوڵ و هیمەتی پارێزەرێکی کورد کە هاتبووە دیاربەکر دوای داکۆکییەکی زۆر لە گرتن و زیندانی ئازادی کرد و تاوانەکانی لەسەر نەما، دواتر پۆلیسی تورکی لەگەڵ چەند کوردێکی ناوداری تر سەر لە نوێ گرتیانەوە. **

حکومەتی تورکیا کە ئامادە نەبوو کێشەی کورد بە شێوەیەکی دادوەرانە چارەسەر بکات و لە هەمان کاتدا کەللەڕەقی دەسەڵاتدارانی ناوچەیی و لۆکاڵی بووە هۆی ئەوەی کورد زۆر بە توندی نارەزاییان بەرامبەر دەربڕن لە سەرەتایی (١٩٦٠) دا کێشەی

ماردین سەری هەڵدا، ئەو کاتە لە ئەنجامی ئەوەی سەربازێك زللەیەکی لە یەکێك لە دانیشتوانانی ماردین دابوو، هێندەی پێنەچوو، هەر چەند کاتژمێرێك بوو شار خرۆشاو بوو بە مەیدانی جەنگ، خەڵکی بەدارو بەرد، عەسکەریش بە تفەنگ. تەنها ئەو کاتەی لەشکری سوارە و تانك بەناو شار کەوتن ئیدی خەڵکی بێ چەکەکەی ماردین هێور بوونەوە. خەڵکی ماردین پشتگیرییان لە راپەڕینی کوردەکانی وان، دیاربەکر، بیتلیس، سێڤریك و ئورفە دەکرد و راپەڕین لەو شارانەدا ئەوەندە بەهێز ببوو حکومەتی عەسکەری ناچار بوو بۆ دامرکاندنەوەی فرۆکەی جەنگی بەکاربهێنن (٦٠- ١٩٦١، ژمارە٥- لا- ٧) .ئەم جۆرە چارەسەرکردنەی کێشەی کورد، سەرکوتکردنی جوڵانەوەی کوردی لە ساڵانی بیستەکان و سییەکانی بیردەخستینەوە. لە ئایاری (١٩٦١) دا لە بورسێ (٨) کوردییان خستە بەردەم دادگە: محمود ئەرتوش، باڵا کارتۆ، ئەمیر کارتاڵ، خالید کارتاڵ، عبدالباقی کارتال، عبدوباوکر ئەرتوش. جافیاگیزێر و عبدالکریم قەرەقوش، کە لەناو (٥٥) گیراوەکەی ساڵی (١٩٦٠) دا بوون رەوانەی بورسو کرابوون. ئەوان بە کاری تێکدەرانە تاوانبارکرابوون دژی یەکپارچەیی خاکی تورکیا. لە تەك رەشبگیریدا، دەسەڵاتدارانی سەربازی ئەو یاسایانەیان بەکارهێنا کە دەبووە هۆی تواندنەوەی ئەو نەتەوانەی کە تورك نەبوون، لەوانە کوردەکان بۆ رێگرتن لە بەردەم بوژانەوەی نەتەوەییان. وەك پێشتر باسمان لێوە کرد دەستووری تورکیادا ساڵی (١٩٢٤) بەدەرنەبوو لە توخمی رەگەزپەرستی و راسیستی کە میللەتانی ناتورکیان لە دەرەوەی یاسا دادەنا. لە کاتی ئامادەکردنی دەستووری (١٩٦١) دا زۆر لە شتە سلبییەکانی دەستووری پێشوویان لابرد. بەم شێوەیە لە جیاتی (هەموو تورکێك) زۆر لە مادەکان بە وشەی (هەموو هاووڵاتییەك) دەستی پێکرد...هتد. بەڵام پێش ئەمە ململانێیەکی زۆر لەناو کۆمیتەی ئامادەکردنی دەستووردا هەبوو .لە کاتی ئامادەکردنی پرۆژەی دەستوورەکەدا لە نێوان لایەنگرانی رادیکالیزمی رەگەزپەرستی تورکی و نەیارەکانیان لێدوانی گەرم هەبوو. سدیق سامی ئۆنار کە پرۆفیسۆر بوو سەرۆکی کۆمیتەی ئامادەکردنی دەستوور بوو.

کاتێکیش کە باس لە یەکسانی گشت زمانەکان دەکرا ئەو، ململانێیەکی توند کەوتە ناو لایەنەکانی ناو کۆمیتە. س.س ئۆنار رای وابوو کە ئەم جۆرە دانپیانانە مەترسی بەدواوە دەبێ، وەك ئەوەی لە داهاتوودا ببێتە هۆی گەشەکردنی کوردیزم، یان کوردایەتی بە پێچەوانەی ئەم مێژوونووسە بەناوبانگی تورك ت. ز- تونای کە ئەندامی کۆمیتەی دەستوور بوو لەگەڵ لایەنگرەکانی رایان وابوو کە ئەگەر رەتی بکەینەوە ئەوا لە دوارۆژدا کێشەی کوردی سەرهەڵدەداتەوە، بە ئاسانی دەکرێ دۆخی مادەکانی تری دەستوور بێلایەن بکرێت. سەرۆکی کۆمسیۆنی ئامادەکردنی دەستوور س. س ئۆنار لەبەر بیروبۆچوونەکانی لایەنگرانی ت. ز. تونای کێشەکەی خستە بەردەم کۆمیتەی یەکێتیی نەتەوەیی، ئەوانیش لە ئەنجامدا تونای و ی. گیریتلیان لە ریزەکانی لێژنەی ئامادەکردنی دەستوور دەرکرد. (٣٠، لا، ٣٧٩- ٣٨٠) .لە کاتی گفتوگۆ و لێدوان لەسەر پرۆژەی دەستوورەکە لەناو کۆنگرەی دەستووریدا ململانێیەکی توند کەوتە نێوان بەشداربوان، لایەنگرانی رەوتی ناسیۆنالیزمی رەگەزپەرستی تورکی هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە بوو روحی ناسیۆنالیستانەی دەستووری پێشوو بپارێزن.

(ج. گورسێل) کە سەرۆکی حکومەتی تورکیا بوو، لە هەموان زیاتر هەڵپەی پێداگرتنی لەسەر بەهێزکردنی رۆحی ناسیۆنالیستی و رەگەزپەرستی لە پرۆژەی دەستوورەکەدا دەکرد. لە وتەیەکدا رایگەیاند ئێمە بە هۆی هەندێ بیرو بۆچونەوە با مجازەفەی لە دەستدانی تورکیزم و ناسیۆنالیزمی خۆمان نەکەین، با چەمکی ناسیۆنالیزم بخەینە ناو دەستوور، خۆ گەر کاتێك ئایدۆلۆجیای تورکیزم لە وڵاتدا هەڵوێستێکی تری وەردەگرت، ئەوا دەکرێ ئەو کاتە لای بەرین، ئێوە ئاگاتان لەو ململانێیە هەیە کە ئێمە لەگەڵ کوردیزمدا دەیکەین، ئەگەر ئێمە واز لە ناسیۆنالیزم بێنن ئایا ئەوان پاڵ ئەدەنە لای ئێمە؟ نەخێر ، بۆیە ئێمە پشت بە ناسیۆنالیزم دەبەستین، ئەگەر لە وڵاتدا حکومڕانیەکی ئاسایی بەرقەرار بکرێت، هیچ مەترسییەك روونادات. پێش هەر شتێك نەتەوەکەمان دەبێتە نەتەوەی تورکیاو پێویستە بۆ تورك بێت...... ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە واز لەمە بێنین، ئەوا دوای (٥٠) ساڵ تاقەیەك تورك لە وڵاتدا نامێنێ. ( ٣٧، بەرگی ٢، لا، ١٠٨٠) .

بەم شێوەیە و لە دوای ئەوەی دەستووری تورکیا خەسڵەتێکی ناسیۆنالیستانەی وەرگرت، دەسەڵاتدارانی تورك هەوڵ و تەقەلایان بۆ ئەوە بوو کەمە نەتەوەکانی تر بتوێننەوە لەوانە نەتەوەی کورد. لەگەڵ ئەوەشدا دانەرانی دەستووری تورکیا توانییان بە رادەیەکی زۆر پرۆژەی دەستوورەکە لە دیاردە و توخمی رەگەزپەرستی (راسیستی) رزگاربکەن کە ئەمەش خۆی لە سەرکەوتنی هێزە دیموکراتییەکانی وڵات دەبینێتەوە.

لە دەستووری (١٩٦١) دا هەندێ حاڵەت و دۆخی وای تیابوو کە لە دەستووری ساڵی (١٩٢٤)دا بوونی نەبوو، بۆ نمونە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دان بەوەدا نراوە کە میللەتانی تری ناتورك لە وڵاتدا بوونیان هەیە. بە گوێرەی مادەی (١٢) هەموو بەرامبەر بە یاسا یەکسانن بە بێ جیاوازی زمان، رەگەز، جیاوازی ئاینی و مەزهەبی. (١٠، لا، ٧) . لەهەمان کاتدا هەوڵ و هیوا بۆ ئەوە بوو دۆخی دەستوورەکە جۆرێك بێت وەك ئەوەی لە وڵاتدا تەنها تورك بژی دانەرانی دەستوور بەردەوام بوون لەوەی بەشێوەیەکی بەرفراوان تەفسیری وشەی تورك بکەن . جگە لە نوێنەرانی ئەو میللەتانەی کە بەزمانی تورکی قسە دەکەن، هەموو میللەتەکانی تریان بەجۆرێ حسێب کردبوو کە هەموویان سەر بە تورکن یان لە ناوەرۆکدا هەر تورکن . مادەی (٢٤) دەنوسێ : هەرکەسێك هاووڵاتییبوونی بە دەوڵەتی تورکیاوە گرێ درابێت - تورکە .

بەم شێوەیە دەستووری ساڵی (١٩٦١) ، هەر چۆنێك بێت نەیتوانیوە خۆی لە دیاردەی شۆڤێنیزمی و رەگەزپەرستی تورکی رزگار بکات کە ئایدۆلۆجیاکەی هەموو جۆرە مافێکی کەمە نەتەوەییەکان لە کۆماری تورکیا رەت دەکاتەوە . بۆ سەلماندنی راستی قسەکانمان ئەم مادەیەی خوارەوە دەخەینە روو:

دەسەڵاتی باڵای دەوڵەت بێ قەید و شەرت دەبێ لەدەست نەتەوەی تورکدا بێت ..... ( مادەی ٤ ).هەموو تورکێك مافی خۆیەتی لەیەکێك لە دامەزراوەکانی دەوڵەتدا کاربکات ( مادەی ٥٨ ).هەموو تورکێك تەمەنی بگاتە (٣٠) ساڵ بۆی هەیە خۆی کاندید بکات (مادەی ٦٨ ).

هەر تورکێك تەمەنی بگاتە (٤٠) ساڵ بڕوانامەی خوێندنی باڵای هەبێ دەتوانێ خۆی وەك سیناتۆر هەڵبژێرێ ( مادەی ٧٢ ) .

لە دەستووری (١٩٦١) دا گەلێ دۆخ و حاڵەت هەن کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دژی کەمینە نەتەوەکان ئاراستە کراون دژی چارەسەری کێشەی کوردن. لە دەستوورەکەدا هاتووە : دەوڵەتی تورکیا بەخاك و نەتەوەوە یەك پارچەیە و قابیلی پارچە پارچەکردن نیە ( مادەی ٣ ) .ئەوە مانای ئەوەیە کە کورد لە تورکیا نەك هەر مافی جیاکردنەوەی خاکی خۆی لە تورك نیە ، بەڵکو بۆی نییە ئۆتۆنۆمیشی لە چوارچێوەی کۆماری هاوچەرخی تورکیادا هەبێ . بە گوێرەی دەستوور هەموو هاوولاتیان ئەو مافەیان هەیە بە ئازادی لەناو وڵاتدا هاتوچۆ بکەن و شوێنی ژیان بۆ خۆیان هەڵبژێرن . بەڵام ئەم ئازادییە دەکرێ بە یاسا سنووردار بکرێت بە مەبەستی دابینکردنی ئاسایشی نەتەوەیی و ئاگادارکردنەوەی لە ئافات ( مادەی ١٨ ) . سەرانی تورك لەژێر چەتری ئەم بیانووە بێ بناغەیەدا لە ساڵانی بیستەکان و سییەکاندا دەیان هەزار کوردیان ئاوارە و دەربەدەری ویلایەتەکانی ڕۆژئاوایی وڵات کرد . دەستووری ساڵی (١٩٦١) دروستکردنی ئەو پارتە سسیاسییانەی قەدەغەکردبوو کە خەبات بۆ بەدیهێنانی مافی نەتەوەکانی تر بە تایبەت کوردەکان بکەن.

مادەی (٥٧) دەڵێ: پەیڕەو و پرۆگرام و چالاکییەکانی پارتە سیاسییەکان پێویستە لەگەڵ (پرنسیپی) یەکپارچەی دەوڵەت و نەتەوەی تورکیا کۆك بێت.

بڕگەی دووەمی مادەی (٦٨) مافی کەمە نەتەوەییەکان پێشێل دەکات، بەوەی کە دەڵێ: هەر کەسێك نووسین و خوێندنەوەی نەبێ بۆی نیە خۆی هەڵبژێرێت بۆ ئەنجومەنی باڵای نەتەوەی تورکیا . ئەگەرچی دەستووری ساڵی (١٩٦١) هەندێ لایەنی پێشکەوتنخوازی پێوە دەبینرا لەگەڵ ئەوەشدا کۆسپ بوو لە بەردەم چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەسەر بنەمای دیموکراسی. لەبەرئەوە لە دوای کودەتای ساڵی (١٩٦٠) ، کوردەکان سەر لە نوێ دەستیان بە خەبات کردەوە لە پێناوی مافی نەتەوەییان. لە کۆتایی مانگی حزیرانی ساڵی (١٩٦٣) وەزیری ناوخۆ بیکات لە ئەنقەرە ڕایگەیاند کە ئۆرگانەکانی ئاسایشی وڵات ڕێکخراوێکی نهێنییان ئاشکرا کردووە و (١٢) کەسیان لێگرتوون کە بۆ بەرژەوەندی کوردەکان کاریان دەکرد. (٥١، ٢٩، ٧١، ١٩٦٣).

هەر پەیوەندیدار بەم رووداوە وەزارەتی ناوخۆ بە پەلە نووسراوێکی ئاراستەی گشت پارێزگاکان کرد داوای لێکردبوون زۆر بە توندی خەبات لە دژی (چالاکی کوردە کۆمۆنیستەکان) بکەن و بە پەلە لێکۆڵینەوە لەو کەسانەی کە گومانتان لێیان هەیە بکەن چالاکی لەو جۆرە ئەنجام بدەن .ڕۆژنامەی ( س ڕ ن خەبەر) لە یەکی تەموزی (۱۹٦۳) دا هەواڵی ئەوەی بلاوکردەوە کە پارێزگارەکان بە پەلە پەیوەندییان بە دامەزراوەکانی پۆلیس و ئاسایشەوە کردووە تا پەلە بکەن لە لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە گومانیان لێدەکرێت .لە دیسەمبەری (۱۹٦۳) دا دادگەی سەربازی فەرماندەیی گشتی دەستی بە پرۆسەی دادگەییکردنی (۲۳) کەس کرد. کە ئەمانە زۆربەیان هاوینی (۱۹٦۳) گیرابوون. هەموو ئەمانە بەوە تاوانبارکرابوون کە چالاکییان لە دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆدا نواندووە. دادوەر کە وشەی کۆتایی دەگوت لە تاوانبارکردنی گیراوەکاندا وتی: هەندێ دەوڵەت لەبەر هۆکاری جیاجیا هەوڵ دەدەن ئائارامی و بێسەروبەری بخەنە ڕۆژهەلاتی تورکیاوە کە جێگەیەکی گرنگ داگیر دەکات لە نێوان بلۆکی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاتدا. دەستێوەردانەکەشی پەیوەندی بە کێشەی کورد و کۆمۆنیستەکانی ناو تورکیاوە هەیە. لە کۆتایدا دادوەر داوایکرد تاوانباران لە سێدارە بدرێن (٥١، ١٨، ١١لا، ١٩٦٣).

گرتن و پرۆسەی دادگەییکردنی کوردەکان بە درێژایی ساڵانی شەستەکان درێژەی هەبوو، پێویستە ئەوەش بلێین کە دەسەلاتدارانی تورکیا چونکە لە شۆڤێنێتی خۆیان و لە بە ئاشکراکردنی کێشەکان دەترسان، بۆیە هەولیان دەدا پرۆسەی سەرکوتکردن و دادگەییکردنی کوردەکان کە لە ژێر کاریگەری جولانەوەی نەتەوەیی خۆیاندا گیرابوون بە نهێنی و لە پشتی دەرگا داخراوەکاندا ئەنجام بدەن .

حکومەتی تورکیا کە سەرکردایەتی سیاسەتی دژە کوردی دەکرد و ڕەشبگیری کوردەکانی گرتبووە بەر، بەردەوامیش بوو لە هەماهەنگی و هاوکاریکردن لەگەڵ وڵاتانی عێراق و ئێراندا بە مەبەستی سەرکوتکردن و لەناوبردنی جولانەوەی ڕزگاریخوازی کوردی. بە پێی هەواڵی ڕۆژنامەی قاهیری (الحقیقە) کە لە نیسانی (۱۹٦۳) دا بلاوی کردبۆوە: نوێنەرانی تورکیا، عێراق، ئێران، لە بەغداد کۆبونەوەیەکیان کردبوو، لەوێدا

باسیان لە پلانێکی عەسکەری بەرفراوان کردبوو بۆ لەناوبردنی جولانەوەی رزگاریخوازانەی نەتەوەیی کورد، رۆژنامەکە دەنووسیێ: لە کاتی کۆبوونەوەکاندا لایەنەکان لەسەر وەشاندنی گورزێکی سەربازی بەهێز دژی کوردەکانی عێراق و تورکیا رێککەوتوون هەروەها داخستنی دەرگای سنوورەکان لە نێوان عێراق، ئێران، تورکیادا. بەلام نە سیاسەتی رەشبگیرانەی توندو نە هەنگاوی عەسکەرییانەی رەق لەناو ولاتدا و نە هەماهەنگی و ئۆپەراسیۆنی تەمبێکردن دژی کوردەکان لە لایەن تورکیا و عێراق و ئێرانەوە، نەیانتوانی جولانەوەی رزگاریخوازی کوردی رابگرن کە لە نیوەی دووەمی سالانی شەستەکاندا تا دەهات بەهێزتر دەبوو.

لە ناوەڕاستی سالانی شەستەکاندا جولانەوەی کوردی گەشەکردنێکی نوێ تری بە خۆوە دیت، فۆڕمی تازەی وەرگرت. لەگەڵ کاری نهێنیدا (بە تایبەت لە دروستکردنی رێکخراوی سیاسی) نیشتمان پەروەرانی کورد بە دوای دۆزینەوەی ئەلتێرناتیڤێکی باشتردا دەگەڕان بۆ ئەوەی بە ئاشکرا لە پێناوی بەرژەوەندی جەماوەری کورددا کاربکەن. یەکێك لەو شێوازانەی خەبات بریتی بوو لە کۆبوونەوەی گەورەی جەماوەری لە ناوچەو گەڕەکەکانی خۆیان کە زیاتر لە ژێر چەتری بۆرژوای — دیموکراتی بەڕێوە دەچوو.

لە میتینگ و کۆبوونەوە جەماوەرییەکاندا باس لەو(٥٥) سەرکردە کوردە دەکرا کە بۆ رۆژئاوای تورکیا دورخرابوونەوە، لە وتارەکاندا باس لە هۆکاری دوورخستنەوەیان کرابوو کە پێشتر بۆیان داڕشتبوون، گوایا ویستویانە جوتیاران لە دەست زوڵمی ئاغاکان رزگاربکەن یان ریفۆڕمی زەوی ئەنجام بدەن، ئەوان زیاتر قسەکانی عەلی بوجاقیان دووبارە دەکردەوە کە یەکێك بوو لەو سەرکردانەی دوورخرابۆوە و پێشتر گوتبووی: کاتێك ئێمە باس لە ریفۆڕمی زەوی دەکەین باس لە عەدالەتی کۆمەلایەتی دەکەین، بۆچی ئێمە قاسماغای (گولێك)و جەویت ئاغا (ئۆرال) ، فەیزی لوتفی قەرە ئۆسمان ئۆغلور حاجی ئاغا و سەرانی تر بیر خۆمان نەهێنینەوە؟ بۆچی ئێمە لەو ئاغایانە کەمترین (٥٦، ١٩٦٨، ژمارە ٣١٠ ،لا- ١٠).کێشەکە لەوەدا بوو کە ئەو کەسانەی کە لە سەرەوە ناومان هێنان، دەرەبەگی گەورەی ناسیۆنالیستی تورکیا بوون بە هیچ جۆرێ ملك و مالیان دەستی بەسەردا نەگیرابوو.

لە راستیدا هەروەك پێشتر باسمان کرد مەبەستی تورك لە دوورخستنەوەی ئەو (٥٥) کوردە هیچ پەیوەندییان بە ریفۆرمی زەوییەوە نەبوو، بۆ ئەوەش نەبوو کە رەوشی زەحمەتکێشانی لادێ چاك بکەن، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بوو کاریگەری سیاسی ئەو سەرکردە کوردانە لەناو ببەن کە لەناو جەماوەردا هەیانبوو، لەبەرئەوە دوورخستنەوەیان ئەوەندەی پێوەندی بە خەسڵەتی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە هەبوو، ئەوەندە خەسڵەتی ئابووری پێوە دیارنەبوو.

گەشەکردنی رووداوەکانی رۆژهەڵاتی وڵات حکومڕانانی تورکی زیاتر نیگەران کردبوو. لە کۆتایی حزیرانی (١٩٦٦) دا لە ئەنقەرە کۆبوونەوەیەکی نهێنی ئەنجامدرا کە راوێژکارانی (٢١) وەزارەت تیایدا بەشداربوون و لێدوانیان دەربارەی کێشەی کورد کرد. وەك چاپەمەنییەکانی تورکیا باسیان لێوەکرد لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاری گرنگ درابوو، وەك دابڕاندنی جەماوەری کورد لە جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردی.

ئەم بڕیارەش بۆ ئەوە بوو گوایا نیازیان هەبوو ئاستی ئابووری و کولتووری و کۆمەڵایەتی (١٦) ویلایەتی رۆژهەڵاتی وڵات بەرز بکەنەوە کە دانیشتوانییان بە زۆری کوردن، بە تایبەت باس لە خزمەتگوزاری سەرمایە دەکرا کە لەو ناوچەیەدا زیاد بکرێت، کردنەوەی قوتابخانەی نوێی تورکی، لە هەمان کاتدا هەر لەو ناوچانە سیستمێکی توندو تیژی ئاسایشی تێدا دامەزرا .

لە ناوەڕاستی ئۆکتۆبەری (١٩٦٧) دا لە ئەنقەرە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە ژێر سەرکردایەتیکردنی سەرۆك کۆمار ج. سونای بەڕێوە چوو. بە گوێرەی هەواڵی چاپەمەنییەکانی تورکیا، لەم کۆبوونەوەیەدا لە تەك هەندێ کێشەی تردا باس لە کێشەی کورد کرابوو وەك رۆژنامەی میللەت نووسیبوی: دوو کاربەدەستی بەناوبانگ لە قسەکانیاندا کە باسیان لە دۆخی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ کردبوو وایان وەسف کردبوو کە (دەستیان لە پشت دەدرێ) (٦٢، ١٧، لا، ١٩٦٧).لەگەڵ ئەوەشدا بە فەرمانی پارتی یەکسانی پارێزگەرەکانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بە هەموو شێوەیەك کۆسپییان دەخستە سەر رێگەی کۆمیتەی ئامادەکردنی کۆبوونەوە جەماوەرییەکان. دەسەڵاتدارانی ناوچەکە جەماوەری ویلایەتەکانی دەوروبەری تونجەلیان قەدەغەکردبوو بێن بۆ بەشداریکردن لە

کۆبوونـەوە جەماوەرییـەکانی تونجەلیـدا. جگـە لەمـەش زۆر بـە تونـدی کارمەنـدانی دەوڵەتییان قەدەغە کردبوو بەشداری لەو جۆرە کۆبوونەوانەدا بکەن. هەروەها بۆ تێکدانی کۆبوونەوەکان، بۆ نەهێشتنی مافی خەڵك بۆ کۆبوونەوە هێزەکانی پۆلیس و جەندرمەیان بەکاردەهێنا. لە شوباتی (١٩٦٧) دا حکومەتی تورکیا بۆ بەهێزکردنی یەدەگی یاسایی خۆی بۆ لەناوبردنی جولانەوەی کوردی مەرسومێکی تری دەرکرد، کە ژمارە(٦/٧٦٣٥ ) بوو. بە پێی ئەم مەرسومە (هێنان وبلاوکردنەوەی هەر جۆرە کاسێت و بلاوکردنەوەیەکی کوردی لەناو تورکیادا قەدەغەیە، بە تایبەت چاپەمەنی و قەوان) (٩، ١٤، ١١، ١٩٦).

ئەم جۆرە بڕیارە نەك هەر ناڕەزایی لـەناو کوردەکانـدا دروسـتکرد، بـەڵکو زۆر لـە ڕێکخراوی کۆمەلایەتی جیاجیا لە دەرەوەی ولاتیش ناڕەزاییان دەربڕی.

ڕێکخراوی کۆمـەڵەی پارێزەرانی نێو دەوڵـەتی لـە ئـەیلولی (١٩٦٧) دا لـە ژنـێڤ ڕاپۆرتێکی بلاوکردەوە کە تیایدا خەسڵەتی کێشەی کوردستانی تورکیای باسکردبوو لـە هەمان کاتدا داوا دەکات مافە سەرەتاییەکان بۆ کورد دابین بکرێت. لە ڕاپۆرتەکەدا باس لەوە دەکات کە حکومەتی تورکیا مافی کوردی پـشت گـوێ خـستووە و هـەوڵ دەدات کوردەکان لەناو ولاتدا وەك نەتەوە بیانتوێنێتەوە. لە ڕاپۆرتەکەیاندا هـاتووە: ئەگەرچـی حکومەتی تورکیا بە پێی ڕێککەوتننامەی لۆزانی – (مادەکانی ٣٨-٣٩) پابەند بـووە کە ڕێز لە مافی نەتـەوە بـچوکەکان بگـرێ، ، بـەلام ئـەو بەڵێنانـەی خـۆی جێبـەجێ نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەم حکومەتی تورکیا کردنەوەی قوتابخانەیان بە زمـانی کوردی قەدەغە کردووە بۆ ئەوەی مناڵەکان فێـری کـوردی نـەبن، هـەروەها ئەوەشـیان قەدەغەکرد کە ئەدەبی کـوردی و کتێبـی کـوردی بێننـە نـاو تورکیـا، جگـە لـەوەش ڕاپۆرتەکە باس لەوە دەکات کە حکومەتی تورکیا بەردەوام ڕاوی کورد دەنێ و لە شوێنی ڕەسەنی خۆیان دەریان دەکاو هەر کەسێکیش دژی ئەو سیاسەتەی تورکیا بێـت لـەناوی دەبا (٥٦، ژمارە، ٣٢٤، لا، ١٢).حکومەتی تورکیا کە قوتابخانەی کـوردی و چـاپ و بلاوکردنەوەی کوردی قەدەغەکردبوو، دەیویست لە سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەی کورددا لەناو تورکیا بەردەوام بێت. بۆ ئەم مەبەستە لە سالانی شەستەکاندا حکومەتی تورکیـا دەستیکرد بە کردنەوەی قوتابخانەی ناوخۆ لە شارەکانی کوردستاندا بۆ ئەوەی منـدالانی

کورد بە پێی یاسای ژمارە (٢٢٠) لە قوتابخانەدا بخوێنن و فێری زمانی تورکی بـبن تـا کولتووری تورکی کاریان تێبکات. (٩، ١٢، ١، ١٩٦١).

زەحمەتە بتوانین بڵێین کردنەوەی قوتابخانەکان بۆ ئـەوە بـوو منـداڵانی کـورد فێـری خوێندن و نووسین بن، چونکە لە ویلایەتەکانی رۆژئاوادا کرد زۆرن و رێژەی خوێنـدەواری لەوێ زۆر کز و نزمە. بەڵام حکومەت لەو ویلایەتانەدا ئەم جۆرە قوتابخانانە ناکاتەوە. بۆ ساڵی (١٩٦٨) نزیکەی (٤٨) قوتابخانەی سـەرەتایی لـەم بابەتـە هـەبوو، کـە تیایـدا (١٤٢٢٩) منداڵ دەیانخوێند، لە ساڵی خوێندنی(١٩٧٠-١٩٧١) لە (٥٧) قوتابخانـەی ناوخۆ (٥١) دانەیان لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بوو، تـەنها(٦) دانـەیان لـە رۆژئـاوا و ناوەڕاستی وڵات بوو، ئەوانەی وەك قۆنیە، ئیستەمبوڵ، ئەنقەرە (٢٦، لا، ٤٠١ - ٤٠٣) . دەبێ ئەوەش بگوترێ کە کوردێکی زۆر لەو شارانەدا دەژیان ئەگەر ئەو قوتابخانانە بـۆ ئەوە بوایە ئاستی خوێندەواری پێ بەرزبکراباوە، ئەوا دەبوایـە لـە شـارەکانی: چـۆروم، گیرێسون، کاستەمۆن، ئۆردو، ئیۆزگات، تۆکات، دروستکرابان چونکە نەخوێندەواری لەم ویلایەتانەدا زۆر بڵاوە .هەر لەم روانگەیەوە گرنگـە بـاس لـەوە بکـەین کـە ویلایـەتی بیتلیس بە پێی سەرژمێری ئاماری ساڵی (١٩٦٥) دانیشتوانەکەی (٢٥٠) هەزار کەس بوون کە لە ( ٧٦٪ ی نەخوێندەوار بـوون) . لـەم شـارەدا تـەنها (٣) قوتابخانـەیان لێ دروستکرد.

لە هەمان کاتدا لە ویلایەتی کاستەمۆنو کە ژمارەی دانیشتوانەکەی (٤٤٢) هەزار کەس بوو رێژەی نەخوێندەوارییان (٦٠٪ ) بوو. کەچی هیچ قوتابخانەی لەم بابەتەیان بـۆ دروست نەکردن. وەك لەو باسـەی سـەرەوەدا بۆمـان ئاشـکرا دەبـێ نیـاز و مەبەسـتی حکومەتی تورکیا لە کردنەوەی ئەم قوتابخانانەدا تـەنها بـە تـورککردنی نـەوەی نـوێی کوردی بووە .

هەر بۆ ئەم مەبەستە دەزگەیـەکی رادیۆییـان لـە کۆتـایی سـاڵی (١٩٦٩) دا لـە دیاربەکر و وان، ئـەرزرۆم، قـارس و چـەندین شـوێنی تـری رۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ دانـا. بەرنامەکانی ئەم رادیۆیانە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ بەرنامەی رادیۆکانی ویلایەتەکانی رۆژئاوادا نەبوو. بەرنامـەکانیان بـە پێـی پـلان و بەرنامـەی بەڕێوەبەرایـەتی رادیـۆ و

تەلەفزیۆن بەڕێوە دەچوو کە بە گوێرەی یاسای ژمارە (٣٥٩) دەبوایە هەلۆێستی ناسیۆنالیزمی تورکی بەهێز کردبا. هەر بۆ ئەم مەبەستەنەك هەر زمان و کولتووری کوردی پشتگوێ خرابوون، بەڵکو ئاشکراش سیاسەتی بە تورککردن لەو ویلایەتانەی زۆربەی دانیشتوانەکانیان کورد بوون بەڕێوە دەچوو. بەم شێوەیە ئەو سیاسەتەی لە سەردەمی سیستێمی فرە حزبیدا دەرهەق بە کورد دەگیرایە بەر هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ئەو سیاسەتەی کە لە بارودۆخی سیستێمی تاقە حزبیدا بەڕێوە دەچوو. تەنها هەندێ شێوە و ئامراز و میتۆدی تواندنەوەی کوردیان جیاواز بوو.

ئەگەر پێشتر بۆ کپکردن و سەرکوتکردنی جولانەوەی کوردی پشت بە ئۆپەراسیۆنی سەربازی و کرداری ئیداری و راگواستنی بە کۆمەڵ دەبەسترا، ئەوا لەو قۆناغەی دواییدا کە باسمان لێوەکرد شێوازی تر بەکاردەهاتن وەك پروپاگەندە و میتۆدی خوێندن بۆ ئەوەی لە رێگەی خوێندن و پەروەردەی تورکانەوە بتوانن سیاسەتی حکومەتی تورکیا لە کوردستان جێبەجێ بکەن .

(١٣) نیسانی (١٩٦٩) دا کۆبوونەوەیەکی جەماوەری (میتینگ) گەورە لە دیاربەکر رێکخرا. لەم کۆبوونەوەیەدا سەر لە نوێ دروشمی سیاسی بەرزکرانەوە و سیاسەتی حکومەتی حزبی عەدالەتیان ریسواکرد کە پرۆژەی داکۆکیکردن لە دەستووری ( ئارامی و ئاسایشی و نیزام ) هێنابووە ناو مەجلیس بە مەبەستی سنووردارکردنی ئازادیە بۆرژوازیەکانی وڵات و وەشاندنی گورز لە جولانەوەی نەتەوەیی کوردی. هەندێ لەو دروشمانەی کە سەرنجراکێش بوون و لە کۆبوونەوەکەدا بەرزکرابوونەوە بریتی بوون لە:

- ئەی پەرلەمانتارەکانی رۆژهەڵات، بەس رۆژهەڵات بچەوسێننەوە .
- ئەم یاسایە داکۆکی لە دەستوور ناکات، بەڵکو لە ناوی دەبات .
- بڕوخێ ئایدۆلۆژیای ئیمپریالیزم .
- میللەت بە پێویستی دەزانێ داکۆکی لە دەستوور بکات.
- بڕوا لە ژێر یاسادا ناشاردرێتەوە.

لەناو ئەم دروشمانەدا، دروشمی وا هەبوو بە کوردی نووسرا بوون (٥١، ١٤، ١٧، ١٩٦٩) .وەك لەو دروشمانەدا دەبینرێ خەڵکی رۆژهەڵات خەسڵەت و بۆچوونێکی دژە

ئیمپریالستیانەیان هەیە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەن کە لە تورکیا جوڵانەوەی کوردی پێی ناوەتە قۆناغێکی نوێی چۆنایەتی. لە هەمان کاتدا جەماوەری زەحمەتکێشی ناوچە کوردییەکان چالاکانە خەبات دەکەن بۆ پشتگیریکردنی هێزە دیموکراتییە پێشکەوتنخوازەکانی تورکیا لە دژی فشاری ئیمپریالیزم و چینە باڵادەستەکان، خەباتیان لە پێناوی چارەسەرکردنی کێشە ئابووری- کۆمەڵایەتییەکان داکۆکیکردنە لە دەستووری ساڵی (١٩٦١). لە سەرەتای ئازاری (١٩٦٩) دا لاوانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات نامەیەکییان بۆ پەرلەمێنتارەکان بڵاوکردەوە کە سەر بە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات بوون. ئەم نامەیە ئاراستەی سەرۆك کۆمار و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکی حزبە سیاسییەکان و کۆمەڵ و ڕێکخراوە پێشکەوتنخوازەکان کرابوو. لەم نامەیەدا لاوان بە توندی سەرکردایەتی حزبی عەدالەتیان مەحکوم کردبوو، ڕەخنەیان لە ئامادەکردنی پرۆژەی داکۆکیکردن لەو سیستێمی دەستوورییە گرتبوو کە بە جۆرێك کارو چالاکی هەموو ئەو کەسانە و کۆمەڵ و ڕێکخراوانەی وەك تاوانبار لە قەڵەم دابوو کە هەوڵیان دەدا بۆ گەشەکردنی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات و دابینکردنی مافی هاووڵاتی و مافی کۆمەڵایەتی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە .لە نامەکەدا هاتووە: پرۆژەی ئەم یاسایە هەوڵێکە بۆ ڕەتکردنەوەی کولتووری جیاواز لە ئەنادۆڵ. ئەگەر ڕەزامەندی لەسەر بکرێ مانای وایە خەڵکە هەرە هەژارەکانی ڕۆژهەڵات نەك هەر لە ژێر ئازاری چەوساندنەوەی ئابووری ئیمپریالیزمدا دەناڵێنن، بەڵکو لە ژێر کولتووری ئیمپریالیزمیشدا تا ئێستە حکومەت بە ئەرکی خۆی دەزانێ مافەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ کەم بکاتەوە و سنوورداری بکات بە تایبەت لە بواری کولتوور و زماندا.

لە کاتێکدا کە چالاکی کرێکاران و جوتیاران و ڕۆشنبیران و هۆشیاران گەشەی کردووە و دەستیان کردووە بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە دەربارەی کولتوور و زمانی خۆیان، حکومەت بە هەموو شێوەیەك هەوڵ دەدات هەموو بۆچوونەکان پۆلێن بکات، هەموو ڕاو گەڕانێکی زانستی بە تاوان بناسێنێ. ئەم هەنگاوانەی حکومەت بۆ ئەوە بوو تاوانەکانی خۆی پێ پەردەپۆش بکات، حکومەت دەیویست لە بایەخیان کەم بکاتەوە و وەك عەقڵ تێکچوو لە قەڵەمیان بدات بۆ ئەم مەبەستەش ڕووی لە سیاسەتی باڵندەی

***(یا ستریب) کردو پرۆژە یاسای فاشیانەییان پیڕەو کرد . تەواوی حیزبە بۆرژواکانی سەر بە پرینسیپی ناسیۆنالیستی و رەگەزپەرستی لەگەڵ ئەو سیاسەتەدا بوون کە رەگەزی ناتورك لە وڵاتدا بتوێننەوە، هەر لەبەر ئەمەشە پرۆگرامی هەموو پارتە بۆرژواکان پرینسیپی رەگەزپەرستی و شۆفێنیزم بەخۆوە دەگریّ. بۆ نمونە لە پرۆگرامی پارتی عەدالەتدا هاتووە، لەسەر ئەندامەکان پێویستە خەبات بکەن دژی هەر جۆرە بیروبۆچوونێك کە ببێتە هۆی دروستبوونی جیاوازی رەگەزی، کولتووری، ئاینی، بیروباوەڕ لە نەریتەکان (مادەی، ٩) هەروەها پێویستە ببنە سەرکردەی ناسیۆنالیزمی تورکی کە هەوڵ بۆ یەکێتی نەتەوەیی تورکیا دەدەن. (٢٧٤، لا، ٦، ٧) .تا رادەیەك ئەو جۆرە کەش و هەوایە لە پرۆگرامی پارتی گەلی- کۆماریشدا تۆمارکرابوو. لە پرۆگرامەکەدا نووسراوە: پ. گ. ك بە ئاواتی ئەوەیە میللەتی تورکیا وەك نەتەوەیەکی یەکگرتوو گەشە بکات کە باوەڕی بە زمان، کولتوور، ئایدۆلۆجیا و چارەنووسی جیاواز نیە.

لە بەرنامەکەدا دەڵێ : حزبەکەمان رای وایە ناسیۆنالیزم بریتییە لە دروستکەر و داکۆکیکەری رۆحی نەتەوەیی و هۆشیاری کە لە ئەنجامدا یەکێتی نەتەوەیی تورکیا لە دایك دەبێ. (مادەی ،٣) (هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە- ٥٨) بەو جۆرە بیروباوەڕە (پارتی جوڵانەوەی ناسیۆنالیستی) سەرکردایەتی دەکرا، کە بە پێی بەرنامەکانی: هەوڵ دەدا بۆ گەشەپێدانی میللەتی تورکیا وەك نەتەوەیەکی یەکگرتوو لە بواری زمان و کولتوور و چارەنووسدا (مادەی ٢٣) (هەمان سەرچاوە، لا، ١٨٣).

ناوەرۆکی سیاسەتی شۆفێنییانەی پارتە بۆرژواکان زیاتر و ئاشکراتر لە پرۆگرامی (پارتی تورکیای نوێ) دا رەنگی دەدایەوە کە تیایدا هاتووە: (دید و تێگەیشتنی ئێمە بۆ ناسیۆنالیزم ئەوەیە کە ناسیۆنالیزم بریتییە لە سۆڵیدارێتییەکی رۆحیانە- دژی هەموو جۆرە جوڵانەوەیەکی فکری جوداخوازانە کە لەگەڵ خۆیدا جیاوازی رەگەزی، ئاینی، کولتوری دروستدەکات، هەروەها جیاوازی ترادیسیۆنی ناوچەیی دروستدەکات، پشت بە هیواو ئاواتی هاوبەشی هاووڵاتییان دەبەستێ کە خۆیان بە نەتەوەیەکی یەکگرتووی خاوەن زمان و کولتوورێکی یەکگرتووی تورکی دەزانن . (هەمان سەرچاوە، لا، ٣٧٦) . شایانی باس ئەوەیە کە هەموو پارتە سیاسییەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆیان لە

کێشەکانی ڕۆژهەڵات هەڵدەقورتاند و ڕای خۆیان لەسەر دەدا. حزبی عەدالەت هەر لە سەرەتای حوکمڕانی خۆیدا زۆر بە وریاییەوە چاودێری ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی دەکرد. ئەم حزبە ڕێکخەری خۆپیشاندانەکان و کۆبوونەوە جەماوەرییەکانی بەوە تاوانبار دەرکرد کە هەوڵ دەدەن وڵات پارچە پارچە بکەن و ئەمانەشی بە خیانەتی نیشتمانی تاوانبار دەکرد، داوای دەکرد خەڵکی بەشدارییان لەگەڵدا نەکەن. (تەلعەت ئەساڵ) کە جێگری سەرۆکی ئەم حزبە بوو لە کاتی سەردانەکەی بۆ ویلایەتەکانی ئورفە، بینگۆل، تونجەلی و شوێنەکانی تر بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری هۆکاری کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکان بێت داوای لە خەڵکی دەکرد بەشداری نەکەن و خۆیان لەم کۆبوونەوانە بەدوور بگرن.

بەڵام ئەم جۆرە بۆچوونەی حکومەت و سەرکردایەتی حزبی عەدالەت دەربارەی ڕووداوەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات لەگەڵ بۆچونەکانی پارتە ئۆپۆزیسیۆنەکان وەك یەك نەبوون، نوێنەرانی پارتی گەلی کۆماری و پارتە ئۆپۆزیسیۆنەکانی تر، ئەوانیش سەردانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتیان کردبوو، بەڵام بەشداری ڕاستەوخۆیان لە کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکاندا نەکردبوو. بە گشتی پارتە سەرەکییە بۆرژوازییەکان لەبەر هەندێ هۆکاری تاکتیکی (هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان نزیك ببوونەوە) زۆر بە ئاشکرا و بە توندی کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکانیان مەحکوم نەکردبوو. بۆ نمونە کەمال ساتیر کە یەکێ بوو لە سەرکردە دیارەکانی پارتی گەلی کۆماری کە (پارتێکی ئۆپۆزسیۆنی بەهێز بوو) لە ماردین خوتبەی دەدا و وتی: پارتی ئێمە زۆر بە وریاییەوە چاودێری ڕووداوەکان و خۆپیشاندانەکانی کردووە، ئێمە تەماشای ئەو کێشەیە دەکەین و بزانین تا چەند لە ژێر کاریگەری هۆکاری ناوخۆ دەرەوەدان و تا چەند دژی یەکپارچەیی خاکی نیشتمان ئاراستەکراوە. من زۆر ڕازیم و بە شانازییەوە دەڵێم کە نیشتمان پەروەران و کوڕانی مەردی ئەم ناوچەیە لە پشتی پاراستنی یەکپارچەیی خاکی نیشتمان وەستاون، بەڵێ کەسانێکیش هەن دەیانەوێ ئەم بارودۆخە بقۆزنەوە و ماسی لە ئاوی لێڵدا بگرن، خۆ ئەگەر ئەوانە بتوانن چەند کەسێکی هەڵەشە و توندڕەو ڕێکبخەن، ئەوا مانای ئەوە نیە هەموو ناوچەکە تاوانبار بکەین (هەمان سەرچاوە ١٨. X. ١٩٦٧) یاساڕێژی تورکیا ڕێگەی بە کەمە نەتەوەکان نەداوە پارتی سیاسی تایبەت بە خۆیان دروست بکەن.

مادەکانی (٨٠- ٩٠) یاسا لە بارەی پارتە سیاسییەکان کە لە تەمووزی (١٩٦٥) دا بڕیاری لەسەردراوە و پەسەنکراوە، دروستکردنی ئەو جۆرە پارتە سیاسییانەی قەدەغە کردووە کە جەخت بکەنە سەر بوونی فرە نەتەوە لە وڵاتدا، یا هەوڵی پاراستنی

بەرژەوەندییەکانی کەمینەکانی خۆیان، یان خەبات بکات لە پێناوی بە دەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەیەکی دیاری کراو......( ١٤، لا، ٢٦٠) .

دروشم و چالاکی دیاریکراوی سیاسی و رێکخراوی کۆمەڵایەتی کە لە لایەن جوڵانەوەی کوردییەوە سەرکردایەتی دەکران، بەڵگەن بۆ ئەوەی بڵێین لە کۆتایی ساڵانی شەستەکاندا خەباتی کوردەکانی تورکیا تا دەهات فراوانتر دەبوو لەسەر بنەمای دژە ئیمپریالیستی بەهێزتر دەبوو .

دیارە ئەم جۆرە گەشەکردنە، ئاساییە کە حکومەتی تورکیا و کۆنەپەرستانی وڵاتانی ناوچەکەی رازی نەکردووە و بە تایبەت لەوە دەترسان بەرەیەك لە هێزە پێشکەوتنخوازەکان دروست ببێ دژی ئیمپریالیزم، هەر بۆیە بڕیاریاندا گورزێکی نوێ لە جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردی بوەشێنن.

لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا تیپەکانی (کۆماندۆسی) و جەندرمەی تورکی جەولەیەکیان بە ناوچەکانی هەکاری، ماردین، سیلڤان، باتمان، بیسمیل، دیاربەکر، مەلازگرد، توتاق، تەکمان، قەرەیازیگ، کیغی کرد. لە کاتی جەولەکردنیان لە ناوچەکەدا خەڵکێکی زۆری مەدەنییان لە کوردستان ئازاردا.

کاتێکیش نوێنەرانی کورد بە ئەفسەر و ژاندارمەکانیان دەگوت هەڵسوکەوت و کردەوەکانتان پێچەوانەی دەستوورە، ئەوان لە وەڵامدا دەیانگوت: دەستوور ئێمە ناوەستێنێ، ئێمە فەرمانمان لە سەرچاوەی (مرجع) بڵندتر وەرگرتووە. (٢٦، لا، ٤٣) .

هەڵوێستی سەرانی تورك لە بارەی رووداوەکانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات نیشانیاندا کە ئەوان نەك هەر نایانەوێ لەسەر بنەمای مرۆڤانە کێشەی کورد چارەسەر بکەن بەڵکو بەردەوام لە هەوڵی بەرپاکردنی سیاسەتی رەشبگیری و لەناوبردنی کورددا بوون. لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ سەرانی پارتە سیاسییەکانی وڵاتدا لە سەرەتای حزیرانی (١٩٧٠) سەرۆك کۆمار سەبارەت بە رووداوەکانی کوردستانی تورکیا وتی: شوێنی دەستی ئەو

چالاکیانە دیارن کە هەڕەشە لە یەکپارچەیی وڵات دەکەن، بە تایبەت لە ڕۆژهەڵاتدا کوردە کۆمۆنیستەکان بەناوی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی هەوڵی وروژاندنی خەڵکی دەدەن، وەك دیارە چەپە توندڕەوەکان کە بە ناوی میللەتانی تورکیا قسە دەکەن، هەوڵ دەدەن نەتەوەکەمان پارچە پارچە بکەن بۆ چەند بەشێکی بچوك لە کوردەکانەوە تا دەگاتە چەرکەسەکان (٥٨، ٨، ٧١، ١٩٧٠) .

لە ناوەڕاستی مانگی حزێران سەرۆك کۆمار لە وەڵامی پرسیارەکانی هەواڵنێری ڕۆژنامەی (جمهوریەت) کەمال ئەیدار، وتی: (وەك چۆن پێشتر هەبوو، ئێستاش لەناوەوە و دەرەوەی دەوڵەت ئایدۆلۆجیاو کردەوەی وا هەندێ دژی یەکپارچەیی وڵات ئاراستە دەکرێن، بەڵام نابێ کەس گومانی هەبێ کە ئەم هەوڵانە چۆن لە ڕابردوو سەری نەگرت ئەمجارەش هەروا دەبێ و هەرەس دێنێ)) ( ٥١، ١٤، ٧١، ١٩٧٠) .

سەرۆك کۆمار سونای جارێکی تر وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، بەڵام بۆ هەواڵنێر ئایدین سۆسیاڵ کە نوێنەری ڕۆژنامەی (ئاکشن) بوو: لە دەرەوە و ناوەوەی وڵات کەسانێك هەن هەوڵ دەدەن ڕووداوەکان و واقیعە مێژووییەکان بە شێوەیەکی نوێ باس بکەن، ئەمە بۆ ئەوەیە هاووڵاتییانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵی تورکیا بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان بەکاربێنن. بەڵام حکومەت و دەوڵەت هۆشیارن، ناکرێ قبوڵی ئەوە بکەین ئەو هەوڵ و چالاکییانەی مەبەستیانە وڵات لەبەر یەك هەڵوەشێننەوە بگاتە ئەو ڕادە زۆرەی مەترسی بۆ سەر ئاسایشمان پەیدا بکات، حکومەت و دەوڵەت ئاگایان لەو پلانانە هەیە، توانا و هێزی ئەوەشیان هەیە بە زووترین کات لە ناویان ببەن ( ٤٨، ١٦، ٧١، ١٩٧٠) .

سەرۆك کۆمار هەمان ئەو قسانەی لە کۆتایی مانگی ئابدا بە بۆنەی جەژنە نەتەوەییەکان لە وتارەکەی خۆیدا، لە ڕادیۆ دووبارەکردەوە (٥١، ٣٠، ٧١١١، ١٩٧٠) .وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە کۆمەڵانی خەڵکی تورکیای وروژاند بوو، بەڵگەی ئەو ڕاستییەن کە سەرانی حکومەتی تورکیا بە هیچ جۆرێ نیازیان نەبووە کێشەکانی وڵات بە شێوەیەك چارەسەر بکەن کە لە بەرژەوەندی هێزە پێشکەوتووەکان بێت و لە بەرژەوەندی گەشەکردنی دیموکراسی کۆماری تورکیا بێت.

لە هەمان کاتدا تیرۆری حکومەت لە ویلایەتەکانی رۆژهەلاتدا، بەهێزتر ببوو، لە کۆتایی حزیرانی سالّی (١٩٧٠)دا (م. ئا. ئایبەر) کە ئەندامی ئەنجومەنی بالاّی نەتەوەیی تورکیا بوو داوای لە سەرۆك وەزیران کردبوو کێشەکە لەناو ئەنجومەندا لێدوانی لەسەر بکرێت، لە گوتارێکی لەناو پەرلەماندا بەلّگەی هێنایەوە کە تیپەکانی کۆماندۆس لە خەلّکی مەدەنی و بێ تاوانیان داوە و ئەم کردەوانەش لەگەلّ ناوەرۆکی دەستووردا پێچەوانەیە .

وەزیری ناوخۆی حکومەتی پارتی عەدالەت لە وەلاّمەکانیدا هەولّی دەدا پاسا و بۆ ئەو زولّم و کارە ناڕەوایانە بێنێتەوە کە لە دژی کورد کرابوون و دەیویست کوردەکان بەوە تاوانبار بکات کە بەردەوام لە دژی کارو کردەوەکانی دەولّەت دەوەستن و پەیوەندیان بەهێزە چەپڕەوەکانەوە هەیە.

وەك چاوەڕوان دەکرا، ئەنجومەنی نیشتمانی کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە نوێنەرانی تورکی دەسەلاّتدار پێك هاتبوو، ئامادە نەبوو تەماشای ئەو داواکارییانە بکات کە پێشکەش بە پەرلەمان کرابوو، داواکارییەکان سەبارەت بەو کردەوانەی حکومەت بوون کە لە دژی رۆژهەلاّتی ولاّتدا کرابوون.

راستە بە گوێرەی هەوالّە چاپ کراوەکانی کوردی دەرەوەی ولاّت لە ئەنجومەنی بالاّی نەتەوەیی تورکیادا نزیکەی (٨٠- ٩٠ ) نوێنەری بە رەگەز کوردی تێدابوو، بەلاّم زۆربەی ئەو کوردانەی کە ئەندامی پەرلەمان بوون. تەعبیریان لە بەرژەوەندییەکانی ئاغاو شێخ و بازرگانە گەورە و دەرەبەگەکان دەکرد، هەر بۆیە هاوکاری و هەماهەنگی ئەوان لەگەلّ تورکەکان و هەموو ئەو کاربەدەست و بالاّدەستانە بوو کە تورك بوون و زەحمەتکێشانی نەتەوە ناتورکەکانی ناو تورکیایان دەچەوساندەوە، ئەوانە لە بنەڕەتدا لە شارەکان دەژیان، بۆ خۆپالاّوتن و پروپاگەندەی پێش هەلّبژاردن سەردانی ناوچە کوردییەکانیان دەکرد، کە ئەنجومەنی بالاّی نەتەوەی تورکیا لە پێش هەلّبژاردندا ئەو پرۆسەیەی رێکخستبوو، هەر بۆیە پێداویستی و داواکاری جوتیارانی کورد بە لای ئەوانەوە ئەوەندە گرنگ نەبوو، هەر بۆیە گوێیان پێ نەدەدان.جولاّنەوەی کوردی لە پێناوی بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی و لە پێناو کۆتاییهێنان بە تیرۆر و رەشبگیری

تورك لە کوردستانی تورکیادا، لەناو خەباتی زەحمەتکێشان گەشەی دەکرد و بەهێز دەبوو، بە تایبەت ئەو کاتەی باس لە مافی ئابووری – کۆمەڵایەتی دەکرا، باس لە دابینکردن و فراوانکردنی ئازادییە دیموکراسییەکان دەکرا، دژی سیاسەتی ئیمپریالیزم و نۆکەر و بە کرێگیراوەکانیان لە تورکیا.

لەو بارودۆخە کۆنەپەرستانەی تورکیادا، لە سەرووی هەموویانەوە جەنەراڵە زلەکانی لەشکر و سوپا بڕیاریاندا دەستێك لە جوڵانەوەی دیموکراسی تورکیا بوەشێنن. لە (١٢)ی ئازاری (١٩٧١) دا سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی تورکیا بیرخەرەوەیەکی پێشکەش بە سەرۆك کۆمار و سەرۆکی پەرلەمان و ئەنجومەنی نەتەوەیی کرد، ئەم بیرخەرەوەیە زیاتر لە (ئولتیماتوم)=(هۆشداری دان) دەچوو. لەم بیرخەرەوەیەدا هاتووە: بێکاری بێ دەسەڵاتی حکومەت و پەرلەمان بێسەروبەری لێکەوتۆتەوە، ململانێ کەوتۆتە نێوان برایان، دۆخی ئابوری و کۆمەڵایەتی شێواوە، لەبەر ئەوە پێویستە حکومەتێك لە سەرووی حیزبەکانەوە دروست بکرێت، کە بتوانێ وڵات لە شێواوی و پەشۆکی بپارێزێ وریفۆرم ئەنجام بدات و دەستووریش بە پێی پرینسیپەکانی( ئەتاتورك) جێبەجێبکات. ئەگەرنا هێزە چەکدارەکانی وڵات ناچار دەبن دەسەڵات بگرنە دەست خۆیان .(٢٩، ٢٧٣، ٢٧٤).

لە هەمان رۆژداحکومەتی پارتی عەدالەت بە سەرۆکایەتی(سلێمان دێمێرێل)کە لە ساڵی (١٩٦٥) دا لەسەر حوکم بوو دەستی لەکار کێشایەوە.

رووداوەکانی ئەو دواییە نیشانیاندا کە سەرباری بیرهێنانەوەی (ریفۆرم) ، سوپا خۆی لە کارەکان هەڵقورتاند بۆ ئەوەی شێوازێکی رەق و توند بگرێتە بەر بۆ دامرکاندنەوەی جوڵانەوەی گەشەسەندووی کرێکاران و خەباتی پێشکەوتنخوازانەی بەشێکی لاواز و رۆشنبیرانی تورکیا و هەروەها خەباتی نەپساوە و بەردەوامی کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتییان .

(٢٦) ی ئازاری (١٩٧١) حکومەتێك لە دەرەوەی حزبەکانەوە بە سەرۆکایەتی نیهاد و ئێریم پێکهات، لە( ٢٦) ی نیسانی هەمان ساڵدا ئەم حکومەتە دۆخی نائاسایی لە شارەکانی ئیستەمبوڵ، کۆجیلی، دیاربەکر، سیرت، بۆ ماوەی یەك مانگ رایگەیاند،

دواتر بۆ چەند جارێك لەو ناوچانە دۆخی نائاسایی درێژکرایەوە. بە شێوەیەکی سەرەکی دۆخی نائاسایی لە ناوەندە ئیداری و پیشەسازییەکانی وڵاتدا راگەیەندرا کە هێزی سەرەکی پرۆلیتاریای تورکیا تێیدا چەکەرەی کردبوو، هەروەها هێزەکانی خوێندکاران، رۆشنبیران و لە باشوری رۆژهەڵاتی وڵاتیش کە جوڵانەوەی کوردی تێدا بەهێز بوو حکومەتی تورکیای پەرێشان کردبوو.

حکومەتی تورکیا کە دەسەڵاتێکی زۆریان پێدرابوو دەستیان بە کۆمەڵێك کارو کرداری سەرکوتکەرانەی دژ بە جوڵانەوەی دیموکراسی لە وڵاتدا کرد، دەستکرا بە قەدەغەکردنی چەندین رێکخراوی سیاسی چەپڕەوانە، داخستنی دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی کۆمەڵایەتی. لە (٢١) ی تەمووزی (١٩٧١) دا حکومەتی تورکیا بڕیاری قەدەغەکردنی پارتی کرێکارانی تورکیدا (لە راستیدا ئەو حزبە لە (٢١)کانونی دووەمی ساڵی (١٩٧١) وە قەدەغەکرابوو) .

بیانووی رووکەشی قەدەغەکردنی چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی تورکیا، دادگەی دەستووری هەڵوێستی ئەم حزبەی لەبەرچاو بوو کە لە کۆنگرەی چوارەمیاندا بڕیارییان لەسەردابوو، بە تایبەت کێشەی کورد، ئەم حیزبە رای وابوو کە ئەم کێشەیە لە وڵاتدا هەیە و چارەسەرکردنیشی لە روانگە و هەڵوێستی شۆڕشگێرانەی چینی کرێکارەوە دەبێت، ئەمە بووە هۆی ئەوەی دادگەی دەستووری ئەم حیزبە قەدەغە بکات.

بە مەبەستی سنووردارکردنی ئازادییەکان، لە ئەیلولی (١٩٧١) دا بەشێك لە ئەندامە کۆنەپەرستەکانی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا، نزیکەی (٣٠) مادەی دەستووری ساڵی (١٩٦١) یان هەموار کرد و گۆڕانیان بەسەردا هێنا. نیهاد وتی: تورکیا پێویستی بەو جۆرە دەستوورە نیە کە لاف و گەزافی پێوە لێدەدا، هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا باسی لەوەکرد کە لە رۆژهەڵاتی وڵاتدا مەترسی هەیە، هێزەکانی سوپا رۆژانە تاوانباران دەستگیر دەکەن و دۆخی نائاساییان لەو ناوچانەدا پیادەکردوە. (٥١، ١٤، IX، ١٩٧١).ئەوەی شایانی باسە، دادگەی سەربازی و دادگەی تایبەتی بوو، کە لە نیوەی مانگی ئایاری (١٩٧١) دا لە دیاربەکر پرۆسەی دادگەییکردنی گروپێکی (٢٢) کەسیان بەڕێوەبرد کە تاوانبارکرابوون بە تۆمەتی دروستکردنی

دەوڵەتێکی کوردی لە ناوچەکەدا، سەرجەم ئەو (٢٢) کەسە ئەندامی ئۆرگانی شۆرشگێڕی کولتووری رۆژهەڵات بوون. (٥٣، ١١، ٧، ١٩٧١).

هەر لەو کاتەدا گروپێك لە شۆرشگێڕان و رۆشنبیرانی کورد لە لایەن حکومەتی تورکیاوە و دەستگیرکران، لەوانە: تاریق زیا ئێکنجی، جانیپ ئیلدریم، کەمال بورقای، ناجی کوتلەی، مەهدی زانا، ئەمین بۆزئەرسەلان، یوسف ئێکنجی و سەدان کوردی تری نیشتمانپەروەر (٦٧، ١٩٧١، ژ، ٢، لا، ٢) .

بە پێی سەرچاوە و چاپەمەنییە کوردییەکانی دەرەوەی وڵات، دوای راگەیاندنی دۆخی نائاسایی لە ناوچە کوردییەکاندا بە تایبەت لە دیاربەکر و سلیڤان نزیکەی (٤٠٠) کورد گیران. (هەمان سەرچاوە).لە (١٧) ی نیسانی (١٩٧٢) دا کۆبوونەوەیەك لە دیاربەکر بە سەرۆکایەتی فەرید سەبارەت بەو کێشانەی کە لە ویلایەتەکانی باشوری رۆژهەڵاتی تورکیا هەبوون سازکرا.

ئەوانەی بەشداربیان لەم کۆبوونەوەیەدا کرد بریتی بوون لە: سەرۆکی هێزی جەندرمەکانی سوپا(کەمالەدین ئێکین)، بەرێوەبەری گشتی دەزگەی ئاسایش ئۆرفان ئێربۆگ. پارێزگەرەکان، سەرۆکی لقەکانی ئاسایش و هێزی. جەندرمەی ویلایەتەکانی ئەدییامان، ماردین، بینگۆل، سیرت، مالاتیا، بیتلیس، ئێلیازیگ و دیاربەکر (٦٢، ١٧، ١٧، ١٩٧١) . لەم کۆبوونەوەیەدا باس لە پێوستی ئەنجامدانی چالاکی سەربازی کرا بە مەبەستی تەمبێکردنی دانیشتوانی کوردستانی تورکیا.

لە کۆتایی نیسانی (١٩٧٢) دا سەرکردایەتی عەسکەری دۆخی نائاسایی لە ویلایەتەکانی دیاربەکر و سیرت لە بەیاننامەیەکدا بلاوکردەوە (ژمارە ٦٣) لەوێدا چالاکییە عەسکەرییەکانی خۆیان دەربارەی تەمبێکردنی خەڵکەکە روونکردبۆوە. لە بەیاننامەکەدا هاتبوو لە ئەنجامی هەزاران زمان لە یەکتردان زیاتر لە (١٠) هەزار کەس گیراون (٦٢، ٢٨، ١٧، ١٩٧٢).لە ئایاری (١٩٧٢) دا دادگەی نائاسایی دەستیکرد بە پرۆسەی دادگەییکردنی ئەندامان و سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا. لە ناویاندا (عەبدولقادر ئۆکتەمان، سێباب بیلگیچ، ئاگیت تانرپیکلو، عارف زێریك، خورشید ئۆنۆك، محەمەد تەیفان، تاهیر ئۆکتیم، حەسەن ئۆکتیم، محمد قوندوس رەمەزان

خادیم نۆگلو، یوسف ئۆگلو، عبدالله کەیایپ تەتار، عبدالجمیل ئێرکان، سەبری ڤێسق، شەرەفەدین ئێلچی، نورەدین عیشق، فازیل چەفت چی، نادر چەفت چی، ئەحمەد قاریار، یوسف بێلق، عەبدی ئۆنار، سەلاحەدین تەیمورتاش، تەها قەرەنتاش، فەخرەدین یاوز، سولێمان خاك خان، موسا عەنتەر، زولکۆ شێخین) و چەند کەسێکی تر حوکمی غیابی دران، واتە لە دەرەوەی وڵات بوون، لەوانە: (دکتۆر سەید قیزمیزی تۆپ رەق، فایق ساواش، نازم بالکاس، حیکمەت بولتەقینە، حەسەن ئیکلمیش و عەلی قەپلان) (٦٢، ٢٣، ٧، ١٩٧٢).هەموو ئەوانە حوکمی جیاجیایان بەسەردا سەپێندرا. لە مانگی ئۆگستی ساڵی (١٩٧٢) کۆمەڵناسی بەناوبانگی تورکیا(ئیسماعیل بێشکچی) لە لایەن دادگەی عەسکەری دیاریەکر بە تاوانی پروپاگەندە بۆ کۆمۆنیزم و کوردایەتی ١٣ ساڵ حوکمی زیندانی بەسەردا سەپێندرا (٦٢، ١٥، ٧١١١، ١٩٧٢).

لە تەك گرتنی کاربەدەستانی پێشکەوتنخواز، دەسەڵاتدارە عەسکەرییەکان چەندین ئۆپەراسیۆنی عەسکەرییان لە شارە کوردییەکان ئەنجامدا بە مەبەستی تەمبێکردنی خەڵك. بە پێی سەرچاوەی رۆژنامەی (حوریەت) (٣٣) گوندی دەوروبەری شاری(باتمان)گشتیان راگوێزرانە ناوچەکانی تر (٥٨، ٢١، لا، ١٩٧٢).

لە تەك بەردەوامبوون لە درێژەپێدانی ئۆپەراسیۆنی عەسکەری لەناو وڵاتدا دژی کوردەکان، حکومەتی تورکیا بەردەوام بوو لە هەماهەنگی کردن بە مەبەستی لەناوبردنی جوڵانەوەی کوردی بە هێڵی سینتۆ.

بەم شێوەیە لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٣) لەتاران کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی سنتۆ بەڕێوەچوو لەکۆتایی کۆبونەوەکەدا لایەنەکان بەیانامەیەکیان بڵاوکردەوە تیایدا هاتبوو کە : لەبارودۆخی شێواودا وچالاکی تیرۆرستان و سنتۆ هەڵوێستی هۆشیاری و ئاگادارانە دەنوێنن (١٩٧٣،٧١،١٣،٦٢) بەواتایەکی تر حکومەتەکانی تورکیا وئێران هەموو هەنگاوێك دەگرنە بەر بەمەبەستی بوارنەدانی گەشەکردنی جوڵانەوەی کوردی لەو وڵاتانە گرتن و راونانی کوردە پێشکەوتخوازەکانی تا هەڵبژادنەکانی ساڵی (١٩٧٣) درێژەی هەبوو ئەم هەڵبژاردنانە بووە هۆی ئەوەی حکومەتێکی تێکەڵاو دروست بێت بە سەرۆکایەتی (بلَند ئەجەوید)کە پێکهاتبوو

لەئەندامانی پارتی گەلی کۆماری و پارتی رەفاهی نیشتمانی دەسەڵاتی گرتنەدەستی حکومەتەکەی (ئەجەوید) بووە هۆی ژیانەوەی ژیانی سیاسی لەوڵاتدا بەهەوڵ و کۆششی پارتی گەلی کۆماری بەهاری ساڵی (١٩٧٤) لەئەنجومەنی باڵای نەتەوەی تورکیا یاسایی لێبوردنی گشتی دەرچوو بەپێی ئەم یاسایە زیندانییەکان ئازادکران لەوانە کوردێکی زۆری سەر بە چەپەکان لەزیندان ئازاد کران دیارە ئەم کردەوە مرۆڤانەیەی کە لە تورکیا ئەنجامدرا هۆکاری و ناوخۆ و دەرەکی هەبووە بەتایبەتی سەرکەوتنی جوڵانەوەی کوردی لەعێراقدا ئەو بڕیارەی حکومەتی عێراق لەئازاری (١٩٧٤) دا کە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا راگەیاند بوو لە هەمان کاتدا ئەم هەنگاوە زیرەی بە حکومەتی تورکیا کردبوو هەربۆیە لەناوەڕاستی مانگی ئازاری (١٩٧٤) دا سەرکرەی هێزە سەربازەییە پیادەکانی تورك ، (جەنراڵ ئەشرەف ئاکنجی) و سەرۆکی هێزەکانی جەندرمەی تورکی (جەنراڵ ئۆرخان ئیکت) جەولەیەکی پشکنین یان بە ویلایەتەکانی دیاربەکر، کرخ تەپەر ئورخەر ، هاردین ، سیرت و چەندین ناوچەی تردا کرد کە مانۆڕی سەربازی تێدا ئەنجام دەدراو یەکێك لەئەنجامەکانی ئەم سەردان و مانۆڕە رێگرتن بوو لەبەردەم ئەگەری سەرهەڵدانی جوڵانەوەی چەکدارانەی کورددا (١٩٧٤/١١١/١٢/٥٨). تا ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاکان لە تەك بەهێزبوونی جوڵانەوەی چەپڕەوی لە تورکیا چالاکی تورکەکانیش زیندووبوونەوە بەجۆرێ رێکخراوی ئاشکرایان دروستکرد و رۆژنامە و گۆڤاریان دەرکرد، سەرباری ئەوەی گۆڤار و چاپەمەنییەکان قەدەغە کرابوون پرۆسەی دادگەییکردنی کوردەکانیش بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەشدا جوڵانەوەی کوردی لە کوردستانی تورکیا تا دەهات فراوان دەبوو، هەر لەو قۆناغەدا بە ئاشکراو نهێنی چەندین پارت و رێکخراوی سیاسی کوردی چالاکییان دەنواند لەوانە : پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا (پ د ك ت ) پارتی کرێکارانی کوردستان (شوانییەکان ) پارتی کرێکارانی کوردستان (ئاپۆیەکان ) پارتی سۆسیالستی کوردستانی تورکیا وەك (کوردستان ئولوسالکورتولیش چولاری ) (نەتەوەی رزگاریخوازی کوردستان ) ئاڵای ئازادی تێکۆشین کاوە.... هتد . ئەم رێکخراوانە چەندین گۆڤارو رۆژنامەیان دەردەکرد، لەوانە (رۆژا وڵات ) (ئۆزگولیۆك یۆلۆ ) رێگەی ئازادی رزگاری (ژینانو )

(دێوەعجی دیموکرات گینچلیك ) (لاوانی دیموکراتی شۆڕشگێڕ ) (ئوزگورلۆك ) ئـازادی تێکۆشین و زۆری تـر. لـەم بلاوکـراوە و چـاپەمەنییانەدا لـە چوارچـێوەی یاسـادا رووە جیاجیاکانی کێشەی کورد لە تورکیا لێك دەدرایەوە و رەخنە لە سیاسـەتی رەسمییانـەی حکومەتی تورکیا دەگیرا هەروەها رەخنەش لە حیزبە بۆرژواکانی تورکیا دەگیرا لەسـەر ئەو هەڵوێستانەی کە بەرامبەر بە کورد هـەیانبوو. هـەر لـەم چـاپەمەنییانەدا تیـشك دەخرانـە سـەر داواکارییـە نەتەوەییـەکان. کـورد هاوکـات لەگـەڵ راپەرینـەکانی دژ ئیمپریالیزم و دژ بە شا لە کوردستانی ئێراندا حکومەتی تورکیا سیاسەتی توندو رەقـی گرتە بەر دژی جوڵانەوەی کرێکاری لـە تورکیـا و دژی خـەباتی کوردەکـانی لـە پێنـاو بەدەستهێنانی مافی نەتەوەییدا. لە کۆتایی مـانگی (دیـسەمبەری) کـانونی یەکـەمی (١٩٧٨) دا حکومەتی تورکیا باری نائاسایی بۆ ماوەی دوو مانگ لە (١٣) ویلایـەت راگەیاند، لەوانە لە ئەنقـەرە ، ئیامـازیگ ، بینگـۆل ، ئـەرزەرۆم ، ئـەرزنجان ، غـازی ئەنتاب ، ئەستەمبول ، کاخرامان ماراش ، قارس مالاتیە ،سیـواس ، ئوفـەر ، بیـاتوە راگەیاندنی باری نائاسایی لەم شارانە بۆ ئەو رووداوە خوێناوییـە ئەگەڕێننـەوە کـە لـە شاری قارەمان ماراش روویدا ئەنجامەکەشی زیـاتر (١٠٠) کـوژراو و سـەدان برینـداری لێکەوتەوە، لە راستیشدا قوربانییەکان زۆر لەو ژمارەیە زیاتر بـوون کـە حکومـەت بـە رەسمی رایگەیاندبوو. دۆخی نائاسایی جگـە لـە ئەنقـەرە و ئەسـتەمبوڵ ئـەو شـارانەی گرتبۆوە کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن. وەزیـری نـاوخۆی تورکیـا ئۆزاریـدنیلی لـە کۆبونەوەیەکی هاوبەشی هەردوو ئەنجومەنی پەرلەمانی تورکیـادا وتـی: ئـەو هـەنگاوە کتوپڕانە کە حکومەت دەینێ بۆ دەرپەراندنی تیرۆر و کوشتن و برینـە کـە خەریکـە بـە ئاشکرا هەڕەشەمان لێدەکەن هەروەها وەزیر وتی : بە تایبەتی لـە باشـوری رۆژهـەڵاتی وڵات ژمارەیەك دەستیان بە ئاژاوەگێڕی کردووە و دەیانەوێ دوژمنایـەتی ئـاینی بخەنـە نێوان توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵ ، بەتایبەتی لە نێـوان سـونەو شـیعە بـە وتـەی (بلەنـد ئەجەوید) ی سەرۆك وەزیران: حکومەتی ناچار بووە دۆخی نائاسایی لەو چەند ویلایەتەدا رابگەینێ تا بە یەکپارچەیی بمێنێتەوە، چونکە چارەنووسی وڵات کەوتبووە بەر هەڕەشەو پەلاماری تیرۆستی و پەلاماری چەکدارانە. پێکدادانی خوێناوی لـەقارەمانان مـەرامی

لەلایەن کۆماندۆسەکانی سەر بە حزبە نیمچە فاشیەکەی جولانەوەی ناسیۆنالستی ئاتاتورکیش دروستکرا بە مەبەستی چاندنی تۆوی دووبەرەکی نێوان شیعە و سوننە.

کۆنەپەرستەکان دەیانویست گورزێك لە جولانەوەی نەتەوەی کوردی بدەن، چونکە لەم ناوچەیەدا کە بەشێکی دانیشتوانەکەی شیعە مەزهەبن کۆنەپەرستەکانی تورکیا هەولیان دەدا موسلمانە سوننەکان دژی موسلمانە شیعەکان هان بدەن، چونکە ئەمەی دوایی (واتە: شیعەکان) زیاتر لایەنگری هێزە پێشکەوتووخوازەکان بوون و لە هەلبژادنەکانی پەرلەمانی (١٩٧٧) دا ئەوان دەنگییان بە هێزە چەپە میانرەوەکان و پارتی گەلی کۆماری دا حکومەتی تورکیا لەکۆبونەوەکانیدا تۆوی دووبەرەکی ئاینی لەنێوان سوننەو شیعەی موسلماندا دەچاند و گوندێکی ئێجگار کەم مابوونەوە شان بە شانی یەکتر سوننەو شیعە بتوانێ بەیەکەوە بژین. پیاوی سوننە نەیدەتوانی کچە شیعەیەك بێنێ بە هەمان شێوە پیاوی شیعە بۆی نەبوو کچە سوننەیەك لە خۆی مارە بکات و بیکاتە هاوسەری خۆی حکومەتی تورکیا کە تۆوی دووبەرەکی دەخستە نێوان سوننەو شیعە مەبەستی بوو گورزێك بوەشێنێتە جولانەوەی نەتەوەیی کوردکە عەلەویەکان لەو ناوچەیەدا لەسوننەکان زیاترن ،گرنگە ئاماژە بەوەش بدەین کە لەتورکیا ئاین پێچەوانەی ئێران و شیعەگەرییە،چونکە لە تورکیا ئاین رۆلی گرنگی نابێ ، لە (٢٠) ئازاری (١٩٧٩) دا لە بارودۆخێکی نائاساییدا چەندین ئاگاداری و رێنمای هاتبوو لەوانە بە گوێرەی ناوەرۆکی ئەو بەیاننامەیە لە ویلایەتەکانی ئەدەنە و قەهرەمان مەراش ، غازی ئەنتاب ، ئورفە ، ژمارەیەکی زۆر لە بلاوەکراوە و چاپەمەنی لە گۆڤار و رۆژنامە قەدەغەکران کە گشتیان ئاراستەی چەپرەوییان هەبوو ئەمە جگە لەو بلاوکراوانەی کە بۆنی کوردایەتییان لێدەهات (١٩٧٩/١١١/٥١ ). لە سەرەتایی نیسانی (١٩٧٩) دا کۆبونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دەستی پێکرد و لەوێدا باس لە کێشەی (جوداخوازی)کورد کرا لەرۆژهەلاتی ولاتدا (١٩٧٩/١٧/٦/٧١) ئەنجومەنی ئاسایشی تورکیا بریارێکی تایبەتی دەرکرد کە بە گوێرەی ئەو بریارە سەرکردایەتی هێزەکانی سوپا هێزە عەسکەریەکانییان لە ناوچەکانی کوردستانی تورکیادا زیادکرد بە تایبەتی لە ناوچە سنوورییەکانی رۆژهەلاتی ولات، ئەو هێزانەی کە

بنکە و بارەگاکانیان لەوێ بوون ئامادەکرابوون بۆ هەرساتێك جەنگ دەست پێ بکەن. بۆ ئەوەی کوردەکانی عێراق دزە نەکەنە ناو سنوورەکانی تورکیا. هێزەکانی سوپای تورکیا بۆ بەرگرییکردن لە خۆیان رێوشوێنی هێزەکانیان گرتەبەر بە تایبەتی لەو سنوورانەی کە خەڵکی زیاتر تێکەڵاویان لەگەڵ یەکتریدا هەبوو سوپای پیادەی تورکی ژمارەیان لەو ناوچانەدا زیاتر کرد لە هەمان کاتدا کۆبوونەوەی چواردە پارێزگەی باشوری رۆژهەڵات، رۆژهەلاتی تورکیا رێکخرا بە مەبەستی زیاترکردنی رەشبگیری لەو ناوچەیەدا و دانانی رێوشوێنی گونجاو بۆ لەباربردنی جوڵانەوەی کوردی، لە هەمان کاتدا هاوکارییەکانی نێوان عێراق و تورکیا بەهێزترکرا بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەی کوردەکان. بەم شێوەیە لە نیوەی یەکەمی نیسانی (١٩٧٩) دا سەرۆك هێزە چەکدارەکانی تورکیا (ئێڤرین) سەردانی عێراقی کرد، وتوێژەکانی ئەو دەربارەی هاوکارییکردنی هەردوو دەوڵەت بوو بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان. (٢٦) ی نیسانی هەمان ساڵ حکومەتی تورکیا دۆخی نائاسایی لە ویلایەتە کوردییەکانی ئەدییامان، دیار بکر ، هەکاری ، ماردین ، سیرت ، تونجەلی راگەیاند بەم شێوەیە دۆخی نائاسایی (١٩) ویلایەتی گرتەوە و دواتر بوو بە (٢٠). حکومەتی تورکیا کە دۆخی نائاسایی رادەگەیاند دواتر بیانووی دەهێنایەوە کە دەستی بێگانە لە پشت هەموو ئەو روداوانەوە هەن چ لە دەرەوەی وڵات و چ لە ناوەوەی وڵاتدا، هەروەها بەرفراوانکردنی ئەو ناوچەو ویلایەتانەی کە دۆخی نائاسایی دەیانگرێتەوە حکومەتی تورکیا لە راگەیاندنێکیدا دەڵێ ( زۆر بە توند و رەقی لەگەڵ هەموو ئەو کۆمەڵە و سەندیکایانە دەجولێنەوە کەدژی دۆخی نائاسایی قسە دەکەن).(٥٢/١٩٧٩/ژ/٦/لا/٥) لە راستیشدا حکومەتی تورکیا یان ئاشکراتر بڵێین دەسەڵاتە بەدەستە عەسکەرییەکان بەردەوام بوون لە گرتنی هەموو ئەو کەسانەی کە تاوانبار دەکران بە کاری تێکدەرانە دژی رژێمی تورکیا. لە مانگی حوزەیرانی (١٩٧٩) دا رۆژنامەی ( ئوزگورلوك ) بە ئازادی دەرچوو لە راستیدا ئەمەش درێژەی ئەو رۆژنامە و چاپەمەنییانە بوو ئەوانەی وەك رێگەی ئازادی و رۆژی وڵات کە لە کاتی راگەیاندنی دۆخی نائاسایی لە ساڵی (١٩٧٨) لە وڵات قەدەغەکرابوو لە شیکردنەوەی بارودۆخی وڵات و کوردستانی تورکیا، بە تایبەتی رۆژنامەی ئۆزگورلوك دەنووسێ: پەیرەوکردنی

سیاسەتی ڕاگەیاندنی دۆخی نائاسایی بۆ بەرژەوەندییەکانی کۆنەپەرستانی تورکیا بە هیچ جۆرێ ناتوانرێ چارەسەری ئەو کێشانە بکات کە لە بەردەم ولاتدا وەستاون، چارەسەری ڕاستەقینەی کێشەی ڕۆژنامەکان پەیوەندی بە گەشەکردنی دیموکراسییەوە هەیە لە ولاتدا کە بریتییە لە جێبەجێکردنی ریفۆرمی کشتوکاڵی و دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا و پێکهێنانی کۆمیتەی هاوکاری جوتیاران و لە ناوبردنی دەرەبەگایەتی و هەڵوەشاندنەوەی مادەی ( ١٤١-١٤٢ ) لە یاسای تاوان و قەدەغەکردنی پارتە ڕەگەزپەرستەکان و دابینکردنی ئازادی و ماف بۆ خەڵکی زەحمەتکێش و کرێکاران و جوتیاران، هەروەها راگرتنی سیاسەتی ناسیۆنالیستانە شۆڤینستانە بەرامبەر بەگەلی کورد و کەمەنەتەوەکانی تر و راگرتنی چەوسانەوەی ئابووری لەسەر کوردستان و پێدانی مافی بەکارهێنانی زمانی دایك بۆ کوردەکان (٦٥/١٥/٧/١٩٧٩) . هەر لەو ماوەیەدا تیرۆر لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا درێژەی هەبوو. وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی (نوێنەری بێلایەن لە ناوچەی ماردین ) شەرەفەدین ئیلیچی ( کورد بەنەتەوە ) بەشداری لەو لێدوانانەدا نەکرد دەربارەی درێژکردنەوەی دۆخی نائاسایی. لە نیوەی دووەمی ئابی (١٩٧٩) دا سەردانی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی کرد بۆ دیراسەکردنی رووداوەکان کە سەردانی (قزل تەپەی)کرد لە ویلایەتی (ماردین) وەزیر گەیشتە ئەو باوەڕەی کە دوای کوژرانی پۆلیسێك لەقزل تەپە هێزەکانی کۆماندۆس دەستیان کردبوو بەلێدان و راونان و ملکەچکردنی خەڵکی مەدەنی ناوچەکە. (٦٨/٢٣/٨/١٩٧٩) بۆجێبەجێکردنی نیزامی چاودێری لەسەر ویلایەتەکانی رۆژهەڵات لە (٢١) ئابی (١٩٧٩) دا (کەنعان ئیڤرین) بە فرۆکەیەك بەرەو دیاربەکر بە ڕێکەوت. سەردانی سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی ولات بۆ کوردستان پەیوەند بوو بە دڵەراوکێی ناوبراوەوە بە دۆخی نائارامی کوردستانەوە لە کۆتایی ئابی هەمانساڵدا وەزیری ناوخۆی حکومەتی ئەجەوید حەسەن فەهمی گنش سەردانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی ولاتی کرد و لە(٢٨) ئابدا ناوبراو کۆنفراسێکی رۆژنامەوانی لەئەرزەرۆم کرد و لەوێدا وتی : حکومەتی تورکیا رێوشوێنی تەواوی گرتۆتەبەر بە ئامانجی نەهێشتن و رێگەنەدان بە هێزە جوداخوازەکان کە لە ئێران و عێراقەوە بپەڕنەوە ناو خاکی تورکیا ( ٦٨ ، ٢٩ ، ٨، ١٩٧٩ ). پێویستە ئەوەش بڵێین

کە لەو ماوەیەدا ژمارەیەك ئەندام پەرلەمانتار نەك هەر داوای راگرتنی تیرۆریـان دژ بـە کوردەکان دەکرد بەڵکو داوای مەحکومکردن و ریـسواکردنی سیاسـەتی خومەینیـشیان دەکرد کە هێرشی سەربازی کردبووە سەر جولانەوەی ئۆتۆنۆمیخوازی کوردستانی ئێران .

(بلند ئەجەوید) لە وەلامی پرسیارەکانی ئەندام پەرلەمانەکاندا بە تایبەت لە حزبی گەلی کۆماری (عەزیز ئۆگلو و یەلماز) کە دەربارەی راپەرینەکانی کوردی کردبوویان وتی حکومەت هەوڵ دەدات تورکیا لەو رووداوانـەی کـە لـە دەرەوە ڕوودەدەن خـۆ بـە دوور بگرێت ، تورکیا تێکەلاوی ئەو رووداوانە نابێت کە  بە کێشەی نـاوخۆی ئێـران حـسێب دەکرێت ( ٥٨ ، ٣١ ، ٨ ، ١٩٧٩ )  لە سەرەتای مانگی ئەیلولی (١٩٧٩) دا (ئەیوب ئۆگلو)کە جێگیری سەرۆکی وەزیران بوو وتـی: جولانـەوەی کوردەکـان لـە رۆژهـەلات و باشوری رۆژهەلاتی تورکیا هەڕەشە لە یەکپارچەی خاکی تورکیا دەکەن و ئەو جولانەوەیە لەناودەبرێت بە شێوەیەك کە پێویست بەوە نەکات هیچ هێزێکی سەربازی زیاتر بنێرینـە ناوچەکە . بەلام بۆچوون و رایەکی تر هەبوو لە تورکیا ئەویش بۆچوونی بـالی راسـتڕەوی بۆرژوای تورك بوو کە پێیان باش بوو زۆر بە رەقی و تونـدی لـە جولانـەوەی نەتـەوەیی کوردی بدرێ . لە مانگی کـانوونی یەکـەمی (دیـسەمبەر) ی (١٩٧٩) دا رۆژنامـەی تورکی ( یانك ) وتارێکی بلاوکردەوە کە تیایدا هـاتبوو (ئەجەویـد ودیمریـل) دەیانـەوێ رژێمی دۆخی نائاسایی لە ولات بەردەوام بێت، بە تایبەت دژی کوردەکان، هەر ئـاوا بـە رەقی بەرێوە ببرێت وەك دوای (١٢) ی ئازار کە هیچ رێکخراوێك دوای ئەوە نەبینرێت . کۆنەپەرستانی تورك بە تایبەت ئەوانەی دەسەلاتیان هەبوو، سـوپا و عەسـکەریان هـان دەدا و ناچاریان دەکردن پەلاماری جولانەوەی نەتەوەیی کـورد بـدەن . لەگـەڵ ئەوەشـدا حکومەتی تورك بەرامبەر بەو ئەفسەرانەی کە بە رەچەلەك کورد بـوون دردۆنـگ بـوو، ئەوانە وەك ئەفسەری پلە دوو مامەلەیان لەگەڵ دەکرا . هیچ کات باوەڕ بـە سـەربازانی کورد نەدەکرا بیانکەنە پاسەوانی جبەخانە و عەمباری چەك و فیشەك ، بەلکو زیاتر بـۆ خاوێنکردنەوەی شوێنەکان بەکاریان دەهێنان . حکومەتی تورکیـا پۆلیـسە کوردەکـانی بەوە تاوانبار دەکرد کە سیاسەت لەناو ئۆرگانەکانی پۆلیسدا دەکەن .

چیتر كوردیان بە پۆلیس قبوڵ نەدەكرد، بۆ نمونـە كوردەكـان زۆر بـە سـەركەوتووی تاقیكردنەوەكانی ساڵی(١٩٧١) یان ئەنجامدا كەچی ئەو ساڵە لە ویلایەتەكانی تونجەلی، وان ، تاقەیەك كورد بە پۆلیس وەرنەگیرا و قبوڵ نەكرا . هەر لە هـەمان كاتـدا وەزیـری پەروەردە و رۆشنەگەری نەتەوەیی كـە لـە حزبـی گـەلی كۆماریـدا بـوو ، دەسـتی بـە حەملەیـەك كـرد بـۆ دەركـردن و دەرپەڕانـدنی هـەموو ئـەو مامۆسـتا كـوردە نیشتمانپەروەرانەی كە لە قوتابخانەكان كاریان دەكرد ، ئەوانـە راگـوێزران بـۆ رۆژئـاوای وڵات .لە ئەنجامدا سەدان مامۆستای نیشتمانپەروەری كورد لە ویلایەتـەكانی قـارس ، ئاگری ، بینگۆل ، بتلیس ، ماردین ، لە كاردەركران و ئاوارە كران یان گیران ( ١٢ ، لا ، ١٥ ).

* یاسای ژمارە ٥٢٢٧ لە ٢٨ ی حزیرانی ساڵی ١٩٤٨- ماوەی گەڕانەوەی كوردەكان بۆ ویلایەتەكانی خۆیان بۆ سـاڵێكی تـر درێژ كرایەوە .(٧، بەرگی ٢٨، لا، ١١١٩- ١١٢٠) .

**- لە كۆتایی ئەیلولی (١٩٦٥)دا كۆتایی بە پرۆسەی دادگەییكردنی (٤٩) كوردەكە هات كە لە (١٩٥٩)دا بەردەوام بـوو، (١٦) كەس یەكی (١٦)مانگ حوكم دران لە زیندان، ئەوانی تر ئازادكران(تەبریـە بـوون)، لـەناو تاوانباركراوەكانـدا پێـنج كـەس لـە كاندیدەكانی ئەنجومەنی تێدابوو، دوو كەس لەوانە سەر بە پارتی كرێكارانی توركیا بوون، یەكێك لەوانەی توركیای نـوێ و دوو كەسـی تریش بێ لایەن بوون.

*** یا سترێب . بە عەرەبی باشق، رخمە، جۆرە باڵندەیەكە.

ئەو لە یەكێك لە وتارەكانیدا وتی: رێكخەری ئەم كۆبوونەوانە غەرەز و مەبەسـتی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەوان دەیانەوێ نیشتمان پارچە پارچە بكەن، نوێنەرانی نەتەوەكەمان بكاتە دوژمنی یەكتر، كارو چالاكیەكانییان بریتییە لـە خیانـەتی نیـشتمانی (٢٢،٥١،لا، ١٩٦٧).

# بەشی سێیەم
# یاسا دەستووربیەکانی تورکیا و کورد
# دوای کودەتای ساڵی ١٩٨٠

پایزی ساڵی (١٩٨٠) بارودۆخی سیاسی ناوخۆی تورکیا تەواو شێوابوون، رەوشی سیاسی شل و شۆق وای لە هەردوو پارتی سیاسی ( پارتی گەلی کۆماری و پارتی عەدالەت ) کردبوو لەسەر دەسەلات نوقمی ناو ململانێی سەخت بن لەسەر دەسەلات، حیزبە راسترەوە ناسیۆنالیستەکانیش دەستیان دابووە تیرۆرێکی درندانە.

تەنها لە ماوەی دوو ساڵدا بە دەستی توندڕەوەکان زیاتر لە (٥) هەزار کەس کوژران و زیاتر لە(١٤) هەزار کەسیش بریندار بوون، قوربانییەکان زیاتر ئەو کەسانە بوون کە دیدو بۆچوونی پێشکەوتنخوازییان هەبوو .

لەم بارودۆخەیدا لە (١٢) ی ئەیلولی (١٩٨٠) دا لە ولات کودەتایەکی سەربازی ئەنجامدرا . سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی ولات دەسەلاتی گرتە دەست . ئەم حکومەتە نوێیە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بە سەرۆکایەتی (جەنراڵ کەنعان ئێڤرین) دروستکرد کە سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی ولات بوو . ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەرکی ئۆرگانی یاسادانانی گرتە ئەستۆی خۆی. ئەو حکومەتەکەی(دێمێرێل) و پەرلەمانی لەبەر یەك هەلوەشاندەوە، چالاکی و کاری گشت پارتە سیاسیەکان و گروپ و رێکخراوە کۆمەلایەتییەکانی قەدەغەکرد، مافی پارێزراوی ئەندام پەرلەمانەکانی نەهێشت و دۆخی نائاسایی لە تەواوی ولاتدا راگەیاند و بلاوکردەوە . سەرکردە عەسکەرییەکانیش وەك پێشتر جارێکی تر رایانگەیاند کە بە هیچ جۆرێ دان بە مافی نەتەوەیی کورد نانێن . رژێمی عەسکەری تورکیا بەردەوام بوو لە درێژە پێدانی سیاسەتی دژە کورد. بڕیاری

دروستکردنی هەرێمی ئاسایشیدا بە قوولای (١٠-٢٠)کم بە درێژایی سنوورەکانی خۆیان لەگەڵ عێراق و ئێران و سوریادا. رژێمی عەسکەری بە ناوی لەناوبردنی چەتەگەریی و کۆنترابانە هەزاران بنکەی ئابووری و بازرگانیان لە غازی ئەنتاب و دیاربەکر و بەتلیس و باتمان و بایەزید و چەندین شاری تر داخست، زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی ئەم شارانە کوردن . دەسەڵاتدارانی عەسکەری تورکیا هەموو ئەو رۆژنامە و چاپەمەنییانەی کە لە لایەن کوردە رۆشبیرەکانەوە دەردەکرا دایخست . لەوانە ( رۆژا ولات ) ( رێگەی ئازادی ) ( ژینانو ) ( دیۆرمجی دیموکرات گێنجلیك ) ( شۆزگورلوك ) ( تێکۆشین ...... هتد ) . لەسەرەتای سالانی هەشتاکاندا لە کوردستان پرۆسەی دادگەییکردنی ئەندامان و سەرکردەکانی پارتە سیاسییە کوردییەکان ، رێکخراو و کۆمەڵەکان ، خاوەن چاپخانە و بنکەکانی پەخشی و وەشاندن دەستی پێکرد. وەك هەموو جارەکانی تر ئەوان بەوە تاوانبارکران کە دەیانەوێ (یەکپارچەی نەتەوەیی تورك ) تێك بدەن و تورکیا پارچە پارچە بکەن. بەپێی سەرچاوەی چاپەمەنییە کوردییەکانی دەرەوەی ولات ، تەنها لە ماوەی سێ ساڵ دوای ئەنجامدانی کودەتا سەربازییەکە زیاتر لە (١٧٠) هەزار کەس گیران و لە زیندانەکاندا ئاخنران و (٢٠٠) کەسیش لەژێر ئەشکەنجەی تورکەکان گیانیان لە دەستدا ، لە ئەنجامی پەلامار و ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورك نزیکەی (٧٠٠) کەس کوژران ، (٤٨) کەسیش لەوانەی کە دژی حکومەت بوون سزای مەرگ و لەسێدارەدانیان بەسەردا سەپێنرا . ( ٦٣ ، ١٩٨٣ ، ژ ، ٥ ، لا ، ٥ ) .

زۆربەی هەرە زۆری ئەم قوربانییانە کورد بوون . دەسەڵاتدارانی عەسکەری لە کاتێکدا کە دۆخی نائاساییان لە تەواوی ولات بلاوکردبۆوە لە هەمان کاتدا بەشێکی سوپای دووەمیان لە قۆنیەوە بۆ مالاتیا گواستەوە، هەر هاوکات بەشێکی ئێجگار زۆر لەشکری عەسکەری لە سەربازگەکانی ویلایەتەکانی رۆژهەلاتی ولات ئامادە کرابوون. لەشکری تورك تەواوی ناوچە کوردییەکانی داگیر کردبوو . بەناوی گەڕان بە دوای چەکدا، کۆماندۆس و جەندرمە و پۆلیس هەڵیان دەکوتایە سەر گوندە کوردنشینەکان و مەڕ و مالاتی جوتیارانیان بە تالان دەبرد . لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی تورکیا بەردەوام بوو لە کار و کردەوەکانی بە مەبەستی بە عەسکەرییکردنی کوردستان . هەر بە هاوکاری

ئەمەریکییەکان لە ناوچەی هەکاری فڕۆکەخانەیەکی عەسکەری دروست کرا و فڕۆکەخانەی ویلایەتی وانیش فراوانترکرا .

بەمەش گرنگی ستراتیجی سەربازی شارە کوردییەکان دەرکەوت . بە سەربازییکردنی کوردستانی تورکیا نەك هەر دژی گەلی کورد بوو، بەڵکو دژی تەواوی جولانەوەی نەتەوەیی رزگاریخوازی ولاتانی رۆژهەلاتی نزیك و رۆژهەلاتی ناوەڕاست بوو . بەمەش تورکیا یارمەتی و پشتگیری ئەمریکییەکانی وەردەگرت . ئیمپریالیزمی ئەمەریکی کۆنەپەرستەکانی تورکیای هاندەدا دژی کوردەکان چالاکی بنوێنن، بە تایبەت لەو شارانەی کە نزیك بوون لە سنوورەکانی سوریا و ئێران و عێراق ئەمەش بۆ ئەوە بوو دۆخێکی وا لە هەرێمەکەدا بخولقێ تا بە ئارەزووی خۆی دەست بخاتە ناو کاروباری ولاتانی ناوچەکە و ئەو ولاتانە ئیستفزاز بکات و تورکیاش بکاتە داردەستی خۆی و بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی بەکاری بهێنێ .بەم شێوەیە بە دەست تێوەردانی ئەمەریکا لە کۆتایی مانگی ئایاری سالی (١٩٨٣) هێزە سەربازییەکانی تورکیا کە ژمارەیان (١٥) هەزار کەس دەبوو سنوورەکانی تورکیا و عێراقیان بەزاند و بە قوولایی (٣٠) کم هاتنە ناو خاکی باکوری عێراق ، ئەو شوێنەی کە بنکە و بارەگاکانی هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی تێدا بوو .بەلام دوای ئەوەی دووچاری بەرگرییەکی بەهێز هاتن لەگەل هێزەکانی پێشمەرگەدا و مەحکومکردنی لە لایەن کۆمەلی نێودەولەتییەوە ناچار بوون ناوچە کوردییەکان بەجێ بهێلن و لە عیراق پاشەکشە بکەن .*

ئەم هێرشەی هێزەکانی تورکیا بۆ خالی کوردستانی عێراق بە ئامانجی لاوازکردن و، سەرلێشێواندنی جولاندنی نەتەوەیی رزگاریخوازی گەشەسەندووی کوردی بوو لەو قۆناغەدا، بۆئەوەی کار نەکاتە سەر جولانەوەی کوردەکانی تورکیا.سیاسەتی کۆنەپەرستانەی سەرکردە عەسکەرییەکان وەك یاسا لە دەستووری نوێی تورکیا کە لە ئەنجامی ریفراندۆمی (٧٧ نۆڤەمبەری سالی ١٩٨٢) جێگیر و پەسەند کرا. ئەم ریفرادۆمە لە دۆخێکی نائاسایی ولاتدا ئەنجامدرا. بە فەرمی راگەیەندرا کە لە (٨٨,٥٪)خەلك لە (٩١٪)ئەوانەی بەشدارییان کرد دەنگیان بە دەستووری نوێی تورکیا دا. بەلام دەنگدەران هیچ جۆرە هەلبژاردنێکی تریان نەبوو. هەر بەم شێوەیە

ڕیفرۆندۆمەکە سەرۆکی ڕژێمی عەسکەری (کەنعان ئێڤرین) وتبووی: ئەگەر میللەت نەڵێ بەڵێ (بۆ دەستووری نوێ ئێمە هەر دەسەلات بەجێ ناهێلین ) .

(٦٦٩, ١٩٨٣,ژ, I, Y, I). بێجگە لەمەش دەسەلاتدارانی عەسکەری بە هیچ جۆرێ بواری ڕەخنە گرتنیان بە دەستوور نەدەدا.

لە لایەکی تر حکومەت بلاوی دەکردەوە کە ئەگەر ئەو کەسانەی بەشداری لەو ڕیفراندۆمەدا نەکەن بۆ ماوی (٥) ساڵ مافی دەنگ دانی لێ دەسێنرێتەوە ، واتە مافی دەنگدانی لە هیچ جۆرە هەڵبژاردنێکدا نابێت .

لەوەش زیاتر لە کوردستان حکومەت پڕوپاگەندە و هەڕەشەی وای بلاودەکردەوە کە ئەگەر کەسێك لە دژی ئەو دەستوورە دەنگ بدات، ئەوا دووچاری ئەشکەنجە دەبێت.

لە بارودۆخی ترس و تیرۆر و تۆقاندندا ئەم جۆرە قسە و باسانەش ڕۆڵی خۆیان لەگوند و دێهاتە نشینەکاندا دەبینی. سەرکردە عەسکەرییەکانی سوپا قسەیان لەگەڵ ریش سپی و پیاوماقولانی کورددا کردبوو، هەڕەشەیان لێکردبوون ئەگەر کەسێك بە (نا) دەنگ بەو لەو ڕیفراندۆمە بدات. لە کاتی دەنگدانیشدا لەسەر سندوقەکانی دەنگدان پۆلیس و جەندرمە وەستابوون . لە بارودۆخێکی ئاوا ترسناکدا دەنگ نەدان یان لە دژی دەستوورەکە دەنگ بدەی پیاوی ئازای دەوێ ، هەر لەم کەش و هەوایەدا لە (٩١٪) بە بەڵێ دەنگیاندا .هەرچەندە ئەنجامی ریفراندۆمەکە لە ڕاستیدا بە دوور بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی بەرژەوەندی خۆیان ئەنجامیان ڕاگەیاند، بۆ نموونە لە کوردستانی تورکیا ئەوانەی دژ بوون ئەوانەی هەر دەنگیان نەدا زۆر لەوە زیاتر بوون کە بە فەرمی لە ولات ڕاگەیەنرابوون .

| پارێزگەکان | دەنگدان لە دژ | دەنگ نەدان |
|---|---|---|
| بینگۆل | ٢٣ ٪ | ١٠ ٪ |
| بەتلیس | ١٣٪ | ٩ |
| دیار بەکر | ٢٠ | ١٣ |
| ئێلیازیگ | ١٥ | ١١ |
| هەکاری | ١٨ | ٣٠ |
| ماردین | ١٣ | ١٢ |
| موش | ١٥ | ١٨ |
| سیرت | ١٢ | ١٩ |
| ئونجەلی | ١٨ | ٢١ |

هەروەك لەو زانیارییانەی سەرەوەدا دەردەکەوێت زۆربەی دەنگدەران لە دژی دەستوورەکە دەنگیان دابوو، لەو نۆ پارێزگەیەی کە دانیشتوانەکەیان بە زۆری کوردن، ڕێژەی ئەو دەنگدەرانەی کە بەشدارییان لە دەنگدان نەکرد یان لە دژی دەنگدان بوون دووجار و نیو لە ڕێژەی سەدا لە ناوەڕاستی ولآت زیاتر بوون ، هەموو ئەو هەڵوێستانە گەواهی ئەوە دەدەن کە سەرباری گرتنی تیرۆر و تۆقاندن کە لە لایەن لەشکری تورکەوە دژی کورد لە کوردستان بەکاردەهات، دانیشتوانی گوندێك کە هەزار کەس دەبوون لە نزیك ماردین تێکڕا بۆ دەنگدان نەچوو بوون، ڕۆژنامەکانی سەر بە حکومەتی عەسکەری تورکیا بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بشارنەوە و لە خەڵکی بشێوێنن نووسیبوویان کە سەرباری بەفر و سەرما و سۆڵەی زستان لە ویلاتەکانی ڕۆژهەڵاتدا ملیۆنەها کەس لە هاونیشتمانەکانمان بەرەو سندوقەکانی دەنگدان ملی ڕێگەیان گرتبووە بەر ( ٥٨ ، ٨ ، ١× ، ١٩٨٢ ) بەڵام (کەنعان ئێڤرین) سەرۆکی دەوڵەت لە سەردانێکی بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات لە دوای ریفراندۆمەکە لە وتارەکانیدا بۆ نمونە لە قارس و ئارتڤین و وتبووی : هەر چەندە چەند کەسێك دژی دەستوور دەنگیان دابوو ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەوانە ئامانجی خراپیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو ، لەبەر ئەوە ئەوانە بە خائین و جوداخواز لە قەڵەم دەدرێن ( ٦٦ ، ١٩٨٣ ، N.٧ ، I ،/y) بە پێی هەندێ بەڵگە و سەرچاوە

دەسەڵاتدارانی عەسکەری دوای هەڵبژاردنەکە رق و کینەی لەو کەسانە هەڵگرتبوو کە بە دڵی ئەوان دەنگیان نەدابوو ، تۆڵەیان لێکردبوونەوە . بۆ نمونە لە دەوروبەری ماردین (١٠) ریش سپی گیران و جوتیارێکی زۆریش بەر هەڵمەتی گرتن کەوتن ، ئەم جۆرە گرتنانە لە شارەکانی بینگۆل و دیار بەکر و سیرت و موش درێژەی هەبوو ( ٦٦ی ١٩٨٣ ، ژمارە ٧ ، لا ، ٢) بەم شێوەیە حکومەتی تورکیا هەوڵی ئەوەی دەدا تۆڵە لەو کەسانە بکاتەوە کە دژی دەستوور دەنگیان دابوو ، یان هەر نەچوو بوون بۆ دەنگدان کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا تەعبیر لە هەستی نەتەوەیی کوردی دەکات.

دەستووری ساڵی (١٩٨٢) ی کۆماری تورکیا وەك دەستوورەکانی پێشووتر ئاواتی گەلی کوردی پشتگوێ خستبوو، دان بە مافی نەتەوەیی گەلی کورد نەدەنا، جگە لەمەش تەعبیرێکی یاسایانە بوو بۆ سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی کورد و گشت کەمەنەتەوەکانی تر لە لایەن حکومەتی تورکیاوە .

بە رووکەش دەستوورەکە دانی بەوەدا ناوە کە گشت هاووڵاتیان بەرامبەر بە یاسا یەکسانن، ئەوەتا لە پێشەکی دەستوورەکەدا هاتووە :

(هەموو هاووڵاتییەکی تورك) ( تورك وەتەن داشی ) نالێ ( هاووڵاتی تورکیا ) (تورکیا وەتەن داشی ) - مافی بە دەستهێنانی ژیانی هەیە لە بوارەکانی کولتووری نەتەوەیی و پێشکەوتن و بیناکردنی یاسا و گەشەپێدانی لایەنی مادی و رۆحی خۆیدا .

دواتر لە مادەی (١٠) دا هاتووە : هەمووان بەرامبەر بە یاسا یەکسانن بە بێ جیاوازی زمان ، ڕەگەز ، ڕەنگی پێست ، بیروباوەڕی سیاسی ، فەلسەفەی جیهانبینی ، ئاین ، هەموو جۆرە باوەڕ و مەزهەبێکی تر .. هتد .

بەڵام ئەگەر تەماشای مادەکانی تری ئەم دەستوورە بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم جۆرە یەکسانییە بوونی نیە ، بەڵکو بە بیرێکی ناسیۆنالیستانەی بۆرژوای تورکی توندڕەو بۆن و بەرامی گرتووە. بە گوێرەی دەستووری کۆماری تورکیا. سەر بە ناسیۆنالیزمی ئەتاتورکە، پشت بە هەندێ بنەما و پرنسیپ دەبەستێ کە لەم پێشەکییەدا هاتووە، مادەی (A-٢) لە تەك چەندین حاڵەت و دۆخی تر کە لە پێشەکییەکەدا هاتووە، ئاماژە بەوە دەکرێت کە ئەم دەستوورە تەواو لەگەڵ تێگەیشتنی

ناسیۆنالیستانەی دروستکەری کۆماری تورکیا ، واتا (ئەتاتورك) ڕێکە و دەگونجێ، دواتر لە پێشەکییەکەدا وتراوە کە : (شکۆمەندی و سەروەری و بێ هیچ مەرجێ دەگەڕێتەوە بۆ نەتەوەیی تورك ، بە هەمان شێوە ئەم جۆرە بۆچوونە دەکرێت لە مادەی شەشدا ببینین کە دەڵێت : (نەتەوەیی تورك سەروەری تەواوی هەیە و خاوەن شکۆمەندییە و ئەم جۆرە سەروەرییە لە ڕێگەی ئۆرگانە جیاجیاکانەوە جێبەجێ دەکات ، هاوجووت لەگەڵ ئەو بنەماییانەی کە لە دەستووردا هاتوون، هەرچەندە لە تورکیا نزیکەی (٣٠) میللەتی جیا جیا دەژین کە ژمارەیان لە(٢٠) ملیۆن زیاترە لەگەڵ ئەوەشدا دەستووری تورکی هەموویانی پشتگوێ خستووە بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو دۆخەیە کە دەڵێ : پێکهاتەی یاسادانان یان یاسارێژی بە ناوی نەتەوەی تورك سەر بە ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیایە = مادەی٧ دواتر = پێکهاتەیی دادگەی قەزائی کە بە ناوی نەتەوەیی تورکەوە ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ دەکات و دادگەیەکی سەربەخۆیە . مادەی /٩/ .

چ لە پێشەکییەکە و چ لەناو دەستوورەکەدا ئەوەندە بڕگەی دیماگۆگی هاتووە کە هەندێکییان بە نمونە دێنینەوە :-

نەتەوەی هەتا هەتایی تورك //. دەوڵەتی تورکیای پیرۆز //، ( نەتەوەی تورکی بلیمەت ) ، . لە دەستوورەکەدا هاتووە :- هەموو تورکێك بۆی هەیە هەموو کارێك لەناو دەوڵەتی تورکیادا بە دەست بێنێت.

مادەی/٧٠/ هەموو تورکێك تەمەنی (٣٠) ساڵ تەواو بکات دەتوانێت بە نوێنەر خۆی هەڵبژێرێت مادەی /٧٦/ ئەدی ئەگەر تورك نەبی. وا پێدەچێت وەك ئەوەی لە دەستووری کۆماری تورکیاوە هاتووە لە تورکیا ناتورك بوونی نەبێت تەنها تورك بوونی هەیە، دەستوورەکە هەوڵ دەدات هەموو هاووڵاتییانی تورك کە سەر بە نەتەوەی تورك نین بە تورك حسابیان بکات .

بەم شێوەیە مادەی (٦٦) دەڵێت : هەر کەسێك هاووڵاتی دەوڵەتی تورکیا بێت تورکە . هیچ تورکێك مافی هاووڵاتیبوونی لێناسەندرێتەوە، ئەگەر ئەو کارێکی وا نەکات ناکۆك بێت لەگەڵ دڵسۆزی بۆ نیشتمان، پێویستە ئەوەش بڵێین کە سەرانی تورك خۆشیان باوەڕییان بەم جۆرە گاڵتەجاڕییە (دیماگۆگیە ) نەبوو، هەر بۆیە تەواوی

سیاسەتەکانییان بەرەو توانەوەی نەتەوە ناتورکەکان ئاراستە کردبوو. بۆ ئەوە بوو کە لە ولآت تەنیا تورك بژی، بەلگەش بۆ ئەم قسانە هەندێ مادەی تری دەستوورەکەیە .

بۆ نمونە : مادەی (٤٢) دەلێت : جگە لە زمانی تورکی هیچ جۆرە زمانێکی تر بۆی نیە لە قوتابخانەکان بخوێنرێن و وانەی پێ بوترێتەوە وەك زمانی دایك . بە واتایەکی تر منداڵانی کەمە نەتەوەکانی تر مافی خوێندنییان نییە بە زمانی دایك و نەتەوەکەی خۆیان. ئەوان تەنها بۆیان هەیە بە زمانی تورکی بخوێنن، ناوەڕۆکی ئەم مادەیە بریتییە لە سیاسەتی تواندنەوە ، هەر لە مادەی (٤٢) دا هاتووە، رێککەوتننامە نێودەولەتییەکان وەك خۆیان دەمێننەوە و دەپارێزرێ واتا هێزی مانەوەیان هەیە .

ئاشکرایە لێرەدا قسە لەسەر رێککەوتننامەی ئاشتییەکە لە کۆنفرانسی لۆزاندا بڕیاری لەسەر درا. مادەکانی (٣٧- ٤٤)دا ئەم رێککەوتننامەیە پەیوەندی بە داکۆکیکردن لە مافی کەمە نەتەوەکانەوە هەیە، بە شێوەیەکی وردتر پەیوەندی بە کەمینە ناموسلمانەکانەوە هەیە ( ٥ ، لا ، ١٥١ ، ١٥٢ ) .

بە گوێرەی مادەی (٣٧) تورکیا وابەستەو دەبێ تەواوی دۆخی مادەکانی (٣٨- ٤٤)جێبەجێ بکات و بیانپارێزێت و دانیان پیابنێ وەك بنەمای یاساکان ، هەروەها تورکیا نابێ هیچ یاسایەك دەربکات، هیچ جۆرە حاڵەت و کردەوەیەك بکات و دروست بکات ناکۆك بێت لەگەڵ دۆخی ئەو مادانەی کە لە سەرەوە باسمان لێوە کرد.

مادەی (٣٨) ی ئەم رێککەوتننامەیە دەلێ : حکومەتی تورکیا دەبێ تەواوی ئازادی و پێداویستییەکانی ژیان بۆ دانیشتوانی تورکیا دابین بکات بە بێ جیاوازی رەگەز و نەتەوە و بنەماڵە و زمان و ئاین .

لە مادەی (٣٩) دا هاتووە : هاوولاتییانی تورکیا ئەوانەی کە موسڵمان نین وەك موسڵمانەکان تەواوی مافی مەدەنی و سیاسییەکانیان پێویستە بۆ مسۆگەر بکرێت.

نابێ بەهیچ جۆرێك و بە هەر بیانویەك بێت سنوور بۆ هاوولاتییانی تورکیا دابنرێ لەوەی کە نەتوانێ زمانی رەسەنی خۆیان بەکاربێنن . ئەم سنووردارکردنە قەدەغەیە ئینجا لە هەر بوارێکدا بێت. لە بوارەکانی بازرگانی یان لە بواری ئاینی، یان لە بواری

رۆژنامەگەری و چاپەمەنییەکاندا یان لە کۆبونەوە ئاشکراو گشتییەکاندا ( ٥ ، لا ، ١٥٢ ) .

بەڵام حکومەتی تورکیا بەردەوام ئەو پابەندبوونانەی وڵاتەکەی خۆی پێشێل کردووە و بەندەکانی رێککەوتننامەی جێبەجێ نەکردووە. بەڵگەش بۆ ئەم قسانە دەستووری نوێی تورکیایە کە چەند حاڵەتێکی سەیر لەخۆ دەگرێت .

لە کات و سەردەمی جیاوازدا، لە چەندین شوێنی جیاوازی وڵاتدا کاربەدەستانی رەسمی تورکیا فەرمانییان دەدا و لافیتەیان هەڵدەواسی و بەردەوام دووبارەیان دەکردەوە کە جگە لە زمانی تورکی قسەکردن بە هەر زمانێکی تر قەدەغەیە. ئیتر ئەمە دەکراو چاکیش دەیانزانی کە دژی ناوەرۆکی دەستوورە. ئەم جۆرە سیاسەتە خرایە ناو دەستوور و بوون بە بڕگەیەکی دەستوور .

بەم شێوەیە مادەی (٢٦) ی دەستوور بە ئاشکرا دەڵێ :

لەکاتی قسەکردن یان نووسین و چاپکردنی بیرو بۆچوونەکانتان ناکرێ ئەو زمانانە بەکاربێنن کە بە یاسا قەدەغە کراون .

مادەیەکی لەم جۆرە کە لە دەستووردا هاتبێ و ناوەرۆکێکی ئاوا شۆڤێنیانەی هەبێ زەحمەتە لە وڵاتێکی تردا بەرچاوت بکەوێ . یانی چی زمان بە یاسا قەدەغە کرابێ. زمان بریتییە لە ئامرازی تێکەڵاوبوونی نێوان خەڵك. بە بێ زمان نە مرۆڤ هەیە و نە کۆمەڵ . لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئاشکرایە کە مەبەستیان قسەکردن لەسەرکام زمانە. هەڵبەت لێرەدا قسە بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر زمانی کوردییە . هێشتا پێش نوێنەرانی دەستەی رۆشنبیری کوردی سەردانی راگوازراوانی پارێزگەی ئەنقەرەیان کردبوو تا، رێگەیان پێبدا بڵاوکراوەی (رۆژنامەی رۆژی وڵات) بە تورکی و کوردی دەربکەن. کارمەندی ئەم کارگوزارییە بە هەڕەشەکردنەوە وتی: دەتوانن ئەم رۆژنامەیە بە هەر زمانێك بتانەوێ دەری بکەن، تەنها بە کوردی نەبێ، ئەگەر واش نەکەن ئەوا سەرێکی زۆر دەپەرێنرێت . ( ٦٦ ، ١٩٨٢ ، ژ ، ٥-٦ ، لا-٤ ) .

لە مادەی (٢٨) دا هاتووە: نابێ هیچ نووسینێك بە زمانە قەدەغەکراوەکان چاپ بکرێت و بڵاوبکرێتەوە. لە دەستووری ساڵی (١٩٦١) دا ئەم جۆرە حاڵەتە بوونی نەبوو.

هەرچەندە خۆ پێشتریش هەر چاپ و بڵاوکردنەوە بە کوردی قەدەغە بوو، بەڵام لێرە و لەوێ چاپەمەنی کوردی هەر بڵاودەکرایەوە. لە دەستووری(١٩٨٢) دا سەرانی کۆنەپەرستی تورك هەوڵیان دەدا بۆچوونە شۆڤێنیەکانیان لە رێگەی یاسا و دانانی یاساوە جێبەجێ بکەن سەبارەت بەو میللەتانەی کە لە تورکیا دەژین و تورك نین .دەستووری نوێ هاتوچۆ و گواستنەوەی شوێنی ژیانی خەڵکی سنووردارکرد، زەمینەی بۆ راگواستنی نوێ خۆشکرد . مادەی (٢٣) لەم بارەیەوە دەڵێ : ئازادی نیشتەجێ و هەڵبژاردنی شوێنی ژیان لەوانەیە کەمبکرێتەوە بە مەبەستی نەهێشتنی تاوان، دابینکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتییەکی گەشەسەندوو، دابینکردن و داکۆکیکردن لە موڵکی دەوڵەت و دروستکردنی شاری هاوچەرخ و خۆشگوزەران .

ئەم مادەیە ئەوەی ئارەزووی لێبێ دەتوانێ زۆر بە فراوانی تەفسیری بکات. حاڵەتی ئەم جۆرە یاسایانە چەندین جار لە ساڵانی بیستەکان و سییەکاندا دژی کورد بەکاردەهێنران بە مەبەستی راگواستنیان لە شوێنی خۆیان بۆ ناوچەکانی ناوەڕاست و رۆژئاوایی وڵات .

ئەگەر بە وردی تەماشای مادەکانی ئەم دەستوورە بکەین، ئەوا لە روانگەی سیاسی و پلانی سیاسییەوە هەر زوو ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە رێك دژی خەباتی جوڵانەوەی کرێکاران و دژی خەباتی نەتەوەیی رزگاریخوازی گەلی کوردە. بۆ زیاتر سەلماندنی ئەم بۆچوونە هەندێ حاڵەتی ئەم دەستوورە بە نمونە دێنینەوە . مادەی (١٤) دەڵێ :هیچ کام لەو ماف و ئازادییانەی کە لەم دەستوورەدا هاتووە ناتوانی بەکاریان بێنی بۆ مەبەست و ئامانجی تێکدانی یەکپارچەیی دەوڵەت، وڵات، نەتەوە، نابێ بەکاربێن بۆ هەڕەشەکردن لەسەر بوونی دەوڵەتی تورکیا و کۆمار .

مادەی (٦٨) دەڵێ :

پەیڕەو پرۆگرامی پارتە سیاسییەکان نابێت ناکۆك بن لەگەڵ یەکپارچەیی دەوڵەت و وڵات و نەتەوە.

مادەی (١٢٢)، لە حاڵەتی کارو کردەوەی توندوتیژیدا کە لە ناوەوەی وڵات یان دەرەوەی هەڕەشە بکەنە سەر یەکپارچەیی وڵات و دەوڵەت و نەتەوە، ئەنجومەنی وەزیران

دەتوانێ دۆخی نائاسایی رابگەیەنێ لە چەند شوێنێکی ولآت یان لـە تـەواوی ولآت بـە گشتی .

پێوەری دڵسۆزی هەرە گەورە و بەرز بە رای دانەری دەسـتووری نـوێ بریتییـە لـە: پشتگیرییکردنی یەکێتی ولآت و نەتەوەی تورك .

لە مـادەی (١٤٣) دا هـاتووە : پێـشنیازی دامەزرانـدنی دادگـەکان دەکـەین بـۆ پاراسـتنی ئاسایـشی دەوڵـەت و تەماشـاکردن و پێداچـوونەوەی ئـەو کێـشانەی کـە پەیوەندییان بەو چالاکییانەوە هەیە دژی یەکێتی نەتەوەی تورك و یەك پارچـەیی خـاکی ولآت ئـەنجام دەدرێـن و دژی ئاسایـشی نـاوەوە و دەرەوەی ولآتـن. بـەم شـێوەیە لـە شیکردنەوەماندا بۆ هەندێ لە مادەکانی دەسـتووری تورکیـای سـاڵی (١٩٨٢) بۆمـان دەردەکەوێ کە ئەم دەستوورە مافی نەتەوەیی میللەتانی نـاتورکی تورکیـای پـشتگوێ خستووە.

لە شیکردنەوەی مادەکانی دەستووری تورکیا دەگەینە ئـەو بـاوەڕەی کـە سـەرانی کۆنەپەرستی تورکیا توانای خۆیان بەگـەڕ خـستبوو بـۆ زیـاتر پیـادەکردنی سیاسـەتی تواندنەوەی کەمینە نەتەوەکانی ترو پشتبەستن بە دەستوور ئەوان رەشـبگیری و راونـانی میللەتانی ناتورکیان زیاتر کرد، بە تایبەت دژی کوردەکان کە جوڵانەوەکەیان لە کۆتایی ساڵانی حەفتاکان و سەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا گەشەی کردبوو روو لە زیادبوون بـوو. دەستووری نوێی تورکیا بە بەراورد لەگەڵ یاسا بنەڕەتـەکانی سـەردەمی کۆماریـدا وەك هەنگاوێك بۆ دواوە وابوو. لە کۆتایشدا ئەم جۆرە دەستوورە دەبێتە مایەی فراوانبـوون و بەهێزبوونی ململانێ و ناکۆکییەکانی نێوان نەتەوە جیاجیاکان و چـینە جیاجیاکـان لـە ولآتدا. دیاردەی زەقی ناسیۆنالیستی دەستووری ساڵی (١٩٨٢). بە ئاشکرا لە پەیڕەو و پرۆگرامی پارتە بۆرژواکانی تورکیادا رەنگی دایـەوە، بـە تایبـەت لـە دوای وەرگرتنـی مۆڵەت بۆ پێکهێنانی پارت و رێکخراوی سیاسی لـە سـاڵی (١٩٨٣) دا هـەموو ئـەو پارتانە ئایدۆلۆجیای ناسیۆنالیزمی بۆرژوازییان بەخۆوە گرتبوو، هەرچەندە بەرنامەکانیان جۆرێك تەفسیری جیاوازی تێدا بوو .

پارتی ناسیۆنالیست، لە هەمووان زیاتر رادیکال و رەگەز پەرستتر بوو، کە پاڵپشتی کودەتای ساڵی (١٩٨٠) بوو. ئەم حیزبە لە برگەی دووەمی پرۆگرامەکەیدا دەڵێ: پارتی دیموکراتی ناسیۆنالیست باوەری بە رۆح و فەلسەفەی (جوڵانەوەی ١٢ ئەیلول هەیە، کە دەوڵەتی تورکیای لە پارچە پارچە بوون و لەتبوون رزگارکرد و نەتەوەی تورکیشی لە لێکترازان رزگارکرد، پارتی دیموکرات بەو ئاراستەیە درێژە بە سیاسەتی خۆی دەدات).برگەی چوارەمی پرۆگرامی ئەم پارتە بۆ تەفسیرکردن و لێکدانەوەی پرینسیپەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی تەرخانکراوە و دەڵێ: دابەشی ناکات بەڵکو یەکگرتن دروست دەکات، ئەمە ناسیۆنالیزمی کولتوورییە هەموو هاووڵاتیان بە یەکەوە دەبەستێتەوە، هەر هاووڵاتییەکی کۆماری تورکیا کە خۆی بە ئەندامی نەتەوەی تورک بزانێ، رێز لە دەوڵەت بگرێ، بەشدارە لە چارەنووس و خۆشی و هۆشیاری نەتەوایەتییدا کە بێگومان ئەو هاووڵاتییە بە ناسیۆنالیستی تورك حسێب دەکرێت.ناسیۆنالیزمی تورکی جەخت لەسەر بەهاکانی نەتەوەیی، مێژوویی، ئەخلاقی دەکاتەوە، ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاستی نەتەوەیی تورکە تا ئاستی شارستانییەتی رۆژئاوا، دژی کۆمۆنیزم و دژی گشت ئەو رژێم و فەلسەفە و ئاینانەیە کە لە دەستووری وڵاتدا قەدەغە کراون و دەبنە مایەی شێواندنی ئارەزووی نەتەوەیی (٦٩، ٢١، لا، ١٩٨٣) بە کورتی و بە واتایەکی تر پارتی دیموکراتی نەتەوەیی خەبات دەکات لە پێناوی رێکخستن و بە یەکەوە گرێدانی هەموو هاووڵاتییانی وڵات بۆ بەرژەوەندی سەرانی شۆڤێنیستی تورکیا، بۆ پتەوکردنی رژێمی حوکم بە دەست، دژی دیموکراسییکردنی ژیانی سیاسی- کۆمەڵایەتی و دژی خەباتی کوردەکانە لە پێناوی بەدەستهێنانی مافی نەتەوەییاندا.

لە مادەی دووەمی پرۆگرامی ئەم پارتەدا هاتووە: پارتی خەڵك باوەری بە ناسیۆنالیزم هەیە. خەبات دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجی ئەوەی هەموو ئەندامانی نەتەوە لە بوارەکانی کولتوور، زمان، چارەنووس و ئیدیاڵ (مپالی) بە نەتەوەیی بکرێن، بە رای ئەم پارتە ئەتاتورکیزم ئامانجی بە مۆدێرنکردنی کۆمەڵی تورکیا بوو. ئەم رێزی بۆ سەربەخۆیی نەتەوەکانی تر دژی هەر جۆرە چەوساندنەوە و زێدەرۆییەك دەستنیشانی تورکیزم (تورکچیەتی) بۆ هاووڵاتیان دەکات نەك لەسەر بنەمای رەگەز و عەشیرەت،

بەڵکو بۆ ئەوەی دڵیان بکەوێتە سەر ئایدیاو کولتـوور و ئامانجـەکانی نەتـەوەی تـورك، داکۆکیکردن لەو یەکێتییەی کە ناکۆکی دروستی ناکات لە نێـوان وڵات و نەتـەوەدا لـە دەوڵەتی تورکیا (هەمان سەرچاوە) .

بەم شێوەیە هەرچەندە پارتی خەڵك کەمێك جیاوازتر لەوانی تر تەفسیری ناسیۆنالیزم دەکات، بەڵام لە پارچە پارچەکردنی نەتـەوە و هەڵوەشـاندنەوەی وڵات و دەوڵـەت هـیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئامانجەکانی پارتی دیموکراتی ناسیۆنالیستدا نییە.

پرینـسیپی ناسـیۆنالیزم لـە پرۆگرامـی پـارتی نیـشتمانیدا (ئەنەڤـەتـەن پـارتی) جێگیرکرا. لە مادەی یەکەمی پرۆگرامی ئەم پارتەدا هاتووە: ئەم پارتە دان بەوەدا دەنێ کە خـۆی بـە ناسـیۆنالیزم و بـەهاکانی ئـەخلاقی و نەتـەوەیی دەبەسـتێتەوە (هـەمان سەرچاوە) .

تەواوی پارتە بۆرژوازەکانی تورکیا دروشمـی ناسـیۆنالیزم و خۆبەسـتنەوە بـە بـیری نەتەوەیی تورکییان بەرزکردبۆوە. ئەم حیزبانە کە ئـەم پرینـسیپەیان لـە پرۆگرامـەکانی خۆیاندا جێگیرکردبوو، جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کـە ئـەوان پابەنـدن بـە ڕێبـازی (ئەتاتورك و کەمالیزم)، کە ڕژێمی حوکم بە دەستە و دژی چارەسـەرکردنی کێـشەکانی نەتەوەیی، ئابووری و کۆمەڵایەتییە لەسەر بنەما دیموکراسییەکان.

بەرنامەی حکومەتیش کە لە لایەن سـەرۆك وەزیـران تورگـوت ئـوزال لـە (١٩)ی دیسەمبەر(کانوونی یەکەم) ی (١٩٨٣) دا خوێندرایەوە و پێشکەش بە ئەنجومەنی باڵای نەتەوەی تورکیا کرا لەگەڵ ڕۆحی دەسـتووری نـوێ و پرۆگرامـی پارتـە سیاسـییەکاندا هاوجووت بوو.

بە گوێرەی پرۆگرام و پرینـسیپ و ئایـدۆلۆجیای حکومـەت پـارتی نیـشتمانی بـە پارتێکی ناسیۆنالیزم حسێب دەکرا، بـە هـیچ جۆرێـك بـاوەڕی بـە مـافی نەتەوایـەتی میللەتانی ناتورکی وڵات نەبوو.

تورگۆت ئۆزال کە پرۆگرامی حکومەتەکەی دەخوێنـدەوە وتـی: (حکومـەتی ئێمـە بریتییە لە حکومەتێکی ناسیۆنالیستی.... بۆچوون و تێگەیشتنی ئێمە بۆ ناسـیۆنالیزم

بۆ داکۆکیکردن لە وتەکانی دەستووره دەربارەی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی نەتەوەی تورك و یەکێتی ولاّت.

دەستووری ناسیۆنالیزمی تورکی ئێمە، لەگەلّ بۆچوونەکانی ئەتاتورك سەبارەت بە ناسیۆنالیزم هاوجووتە کە دەبنە بنەمای فکری کار و چالاکییەکانی ئێمە).

لە هەمان کاتدا حکومەت بەلّێنیدا بەردەوام خەبات دژی ئەنارشیزم، تیرۆریزم، سیپاراتیزم (جوداخوازی) و جولاّنەوەی توندڕەوی بکات بە قسەیەکی تر مەبەستی بوو درێژە بە سیاسەتی پێشووی خۆی بدات لە سەرکوتکردنی جولاّنەوەی چینایەتی کرێکاران و جولاّنەوەی نەتەوەیی رزگاریخوازی کوردەکان.

لە درێژەپێدانی سیاسەتی شۆڤێنیستانەیاندا بەرامبەر بە گەلی کورد، لە ئایاری (١٩٨٣) دا ئەنجومەنی راوێژکاری یاسایەکییان پەسەندکرد دەربارەی راگواستن (میللی ئیسکان یاساسی). بە گوێرەی ئەم یاسایە و بە بیانووی پاراستنی (ئاسایشی نەتەوەیی) دەسەلاّتدارانی تورك بۆیان هەبوو بە زۆر خەلّك لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر بگوازنەوە (٥٥، ١٩٨٣، ژ، ٥٤، لا، ٤) بە کورتییەکەی لە کاتێکدا ئەگەر جولاّنەوەی نەتەوەیی رزگاریخوازی کوردی گەیشتە ئاستێکی بەرز ئەوا حکومەتی تورکیا دەتوانێ (یاخی بووە) کوردەکان رابگوازرێ بەرەو شارەکانی رۆژئاوایی تورکیا، وەك چۆن چەندین جار ئەم دیاردەیە لە سالاّنی بیستەکان و سییەکاندا دووبارە دەبوونەوە و روویان دەدا. بە پێی سەرچاوە کوردییەکان کە لە دەرەوەی ولاّت بلاّویان دەکردەوە، بە تایبەت رۆژنامەکانیان، لەسەر بنەمای ئەم یاسایە چەندین خێزانی کورد بەرەو شارەکانی رۆژئاوای ولاّتدوورخرانەوە ( ١٩٨٣/٦٣ژ،٥، لا،٧) ناکرێ بوترێ کە حکومەتی تورکیا لەو قۆناغەدا تەنها لە رێگەی عەسکەری و سیاسییەوە ویستویەتی چارەسەری کێشەی کورد بکات، بەلّکو بڕیاری ئەوەیان دابوو کە کارێکی وا بکەن گەشە بە ناوچە کوردییەکان بدەن و بەرای ئەوان ئەو گرژییەی کە لە کوردستانی تورکیادا هەیە کەم دەبێتەوە . ئەوەبوو سەرۆکی حکومەت تورگوت ئوزال وتی: (ئەو پرۆژەیەی کە بە رای ئێمە یەکجار گرنگە و سوودی کۆمەلاّیەتی و ئابوری دەبێ، پرۆژەی گەشەپێدانی باشوری رۆژهەلاّتی ئەنادۆلّە، ئێمە لە جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە بە ئەرکی نیشتمانی خۆمانی

دەزانین کە هەموو ڕێگەو شوێنێك بگرینە بەر بۆ ئەوەی لە کورتترین ماوەدا جێبەجێ بکرێت. یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی حکومەت بریتییە لە گرنگی پێدان و گەشەپێدانی ئابووری شارەکانی تورکیا، بە تایبەتی ناوچە دواکەوتووەکان. بە پلەی یەکەمیش شارەکانی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆل و ناوچەکانی باشوری ڕۆژهەلات دێن بۆ ئەوەی ئەو جیاوازییە کەم بکرێتەوە کە هەندێ ناوچە دەوڵەمەند و پێشکەوتووە و هەندێکی تریشی هەژار و دواکەوتووە لە وڵاتدا . بە گوێرەی ئەو بەرنامەیەی کە لە تەمووزی (١٩٨٤) دا هێزی یاسای وەرگرتبوو لە (٢٧) شار و پارێزگەدا ( هەرێمی ئازاد ) ڕاگەیەنرا، لەناو ئەو هەرێمانەدا. ڕۆژهەلات و باشوری ڕۆژهەلاتی گرتووەتە. بەپێی ئەم بڕیارە مۆنوپۆلی فرە نەتەوەیی و توانایی ناوچەیی خۆماڵی کە وەبەرهێنانیان کردووە لە شارەکانی ئاگری، قارس، تونجەلی ، بنیگۆل ، موش ، بتلیس ، سیرت ، هەکاری ، گوموشانێ و وان باج و گومرگی پێویست نادەن و ئەو مۆنۆپۆلانەی کە سەرمایە گوزارەکان کردبوویان لە پارێزگەکانی سیواس، مالاتیە، ئیلیازیگ، دیاربەکر، ئادیامان، قارەمان مەرەش، ئورفە، چان کیری، چۆروم، قاستەمۆن، سینۆپ، یۆزگاد، ئارتڤین، ئەرزەروم، ئەرزنجان و ماردین تەنها لە(٤٠٪) گومرگ و باجەکە دەدەن. بۆ ئەم مەبەستە دەبوایە سەرمایەیەك بەکاربێت بۆ بەرهەمهێنان لە بوارەکانی ئابووریدا وەك کشتوکاڵ و ئەو بوارانەی کە پەیوەندییان بەوەوە هەیە ، پیشەسازی و دەرهێنانی سامانی ژێر زەوی و بەرهەمهێنانی جەنگی. کاتێك کە حکومەتی تورکیا ڕایگەیاند شارە کوردییەکان بە هەرێمی ئابووری ئازاد حیساب دەکرێن، هەوڵی دەدا سەرنجی کەپیتاڵ و سەرمایەی بێگانە بۆ ئەو ناوچانە ڕاکێشن بە مەبەستی چەوساندنەوەی خەڵك و سامانی کوردستانی تورکیا، چونکە لەبەر ناجێگیری دۆخی سیاسی لەو هەرێمەدا بۆرژوای تورك نەیدەویست سەرمایەی خۆی تێدا بەکاربێنێت . هەرچەندە ریکلام و پروپاگەندەیەکی زۆر بۆ ئەو پرۆژانە دەکران، حکومەتی تورکیا نەیتوانی بچوکترین هەنگاوی ئاشتیانە بنێ لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕۆژهەلات و باشوری ڕۆژهەلاتی تورکیادا بۆ کەم کردنەوەی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کوردی، هەر بۆیە لە هێرش و پەلاماری سەربازی خۆیان بەردەوام بوون بە تایبەت لە پەلاماری تەمبێکردندا بۆ سەر ناوچە کوردییەکان .

هێرش و پەلامارە سەربازییەکانی ئەنقەرە مەترسی بۆسەر بەرژەوەندییەکانی میللەتان و وڵاتانی ناوچەکە دروست کردبوو. ئەو ناوچانەی کە جوڵانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی تێدا هەڵگیرسابوو، بە تایبەت هەوڵ و جوڵانەوەی نەتەوەی کوردی لە تورکیا و عێراق و ئێران کە ئۆپەراسیۆنە پارتیزانییەکان تا دەهات فراوانتر دەبوو . بەهێزبوونی جوڵانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی لە کوردستاندا بووە هۆی ئەوەیك کە حکومەتەکانی تورکیا و عێراق لە ساڵی (١٩٨٢) دا رێککەوتننامەیەك مۆر بکەن، لەم رووەشەوە گرەو لەسەر هێزی سەربازی تورکیا کرابوو بۆ دژایەتییکردنی هێزە نیشتمانپەروەرەکانی کورد. ئامانجی دڕندانەی رێککەوتننامەی( عێراق - تورکیا )و جێبەجێکردنی مادەکانی ئەم رێککەوتننامەیە بریتی بوون لە هەڕەشەکردنێکی جدی بۆ سەر ئاشتی لە هەموو ناوچەکەدا واتە لە رۆژهەڵاتی نزیکدا. لەم بارەیەوە ئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا( عەلی ئیلەری) و ئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی عێراق( کازم حبیب ) بەهەڵەدا نەچووبوون کە وتبوویان ئەم رێککەوتننامەیە نەك هەر دژی بەرژەوەندییەکان و مافە یاسایەکانی گەلی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا ئاراستەکرابوو، بەڵکو سەرەتایەکی نیاز خراپی ئیپریالیزمە، پێش هەمووشیان ئیمبریالیزی ئەمەریکییە بۆ هەموو ناوچەکە . هەر لەو روانگەیەوە هەردوو پارتی کۆمۆنیستی برا، تورکیا و عێراق بەیاننامەیەکی هاوبەشیان بڵاوکردەوە و لەوێدا جەختیان لەسەر ئەوە کردبۆوە کە لە رێی تورکیاوە وەك ئەندامێکی بلۆکی لەگەڵ وڵاتە زلهێزەکاندا کە ئەندامی ئەم بلۆکەن و دەیانەوێ کاریگەرییان لە ناوچەکەدا زیاترو بەهێزتر بێت. رۆڵی جەندرمە و ناوچە و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا رێك لەگەڵ بەرژەوەندییەکان و ئاواتەکانی حکومەتی تورکیا دەگونجێت. کە ئەمانە هەر خۆیان رێگەی شۆڤێنستی و فراوانخوازی دەگرنەبەر و بە ئاواتی دەخوازن .

بێگومان رێککەوتننامەی دوور لە رەوشت و چالاکی دڕندانە هەڕەشەن بۆ سەروەری هەردوو دەوڵەت و ئەمانە زەمینە خۆش دەکەن تا هێزی بیانی دەست بخاتە ناو کاروباری ناوخۆی هەردوو دەوڵەتەکە و ئەوجا دەبنە مەترسی گەورە بۆ سەر ئاشتی ناوچەکە و هەموو جیهان ( ١٩٨٥،٤٧،ژ،٤،لا،٩٦ ) هەردوو پارتی کۆمۆنیستی عێراق و تورکیا

داوایان کرد بە پەلە هێرش و پەلامارە سەربازییەکانیان لەسەر سنوورەکان راگیرێ، ئەوان بانگەوازیان بۆ هێزە پێشکەوتووخوازەکانی جیهان و کۆمەڵی نێودەولـەتی بلاوکـردەوە، داوایان لە هەموو ئەو لایەنانە کرد کە ئاشتییان بە لاوە گرنگ و پەسەندە تا پـشتیوانی لە خەباتی عادیلانەی کۆمەنیستەکان بکەن و پشتگیری خەباتی هێزە پێشکەوتوخواز و دیموکراتییەکانی هەردوو دەوڵەت بکـەن دژ بـە گەشەسـەندنی دیکتـاتۆری و لـە پێنـاو هێنانەدی ئەلتێرناتیڤێکی دیموکراتیدا .

لــە راگەیاندنــەکان و هەواڵــەکانی کاربەدەســتانی تورکیــادا بــە تایبــەت لــە چاپەمەنییەکاندا سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنەکان، سیاسەتی تورکیا لە ناوچە کوردییەکاندا وا لێراهاتبوون کە ناو و ناتۆرەی سەیر بەسەر جوڵانەوەی کوردییدا بسەپێنن و دەیانگوت ( تیرۆریست ) مەترسـییە لـە لەتلـەتبوونی خـاکی تورکیـا. هـەروەها دەیـانگوت " کۆمەنیـستەکان " و " مارکـسییەکان " ی رێکخـراوە تیرۆریـستەکان پـشتیوانی لـە کوردەکان دەکەن. دەزگەی هەواڵی ئەنادۆل بەردەوام سەردێری وای بلاو دەکردەوە کە لـە راستیدا سیاسەتە بێ بەزەییانەکەی حکومەت نیشان دەدەن و هەموو ئەوانەش نیشانەی هەڵچوون و گەرمبوونی دۆخی ویلایەتەکانی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا بـوون . لەگـەڵ ئۆپیراسیۆنە سەربازییەکاندا حکومەتی تورکیا کاری سیاسی و ئیداریشی دەستی دابوویە کە بە رای ئەوان ئەمە یاریدەدەرە بۆ سەرکوتکردنی رزگاریخوازی جوڵانــەوەی نەتــەوەیی کوردەکان . هەر لەم دیدەوە لە (٤) ی نیسانی (١٩٨٥) دا دوو بڕیاری تریش بـۆ سـەر یاساکان لە بارەی گوندەکانەوە زیادکران، بە گوێرەی ئەمــە وەك پێـی دەڵـێن پاسـەوانی دێهات، دەبوایە ئەم پاسەوانانە بە فەرمی داکۆکییان لە دانیشتوانی دیهاتەکان بکردایـە و ژیـان و سـەروەت و سـامانییان بپاراسـتنایە ( ١٧،٧٣-٢٣، ١١١ ، ١٩٨٦ ) لـەم رووەشەوە حکومەت چەك و پاداشتی ئەدانێ، بەڵام هەر زوو ئەم دیاردەیە ( پاسـەوان ) گۆڕانی بەسەردا هات و لە جیاتی گەڕان بە دوای تیرۆریستاندا کەوتنـە گیـانی خـەڵکی مەدەنی، جگە لە ئازاردان، دەستدرێژیشیان دەکردنە سـەریان. لـە شـوباتی(١٩٨٦) دا حکومەتی تورکیا بڕیاری راگواستنی دانیشتوانی (١١) دێهاتی سەر سنوورەکانی عێراق و ئێرانیدا بۆ ناوچەکانی ناوەڕاستی ئەنەدۆڵ، ئەم راگواستنە بە مەبەستی دژایەتییکردنی

تیرۆریستان كرا كە لە دەرەوە روویان كردبووە ناوچەكە، لە هەمان كاتدا سوپا و لەشكری توركیا بە ناوچەكەدا بلاّوبوونەوە گوایا بۆ پاراستنی ئاسایشی دەولّەت. لەمەش بترازیّ حكومەتی توركیا لە دژی كۆمەلّیّك كردەوەی دیكەشی دەست پیّكردبوو، بۆ نموونە لە دوای كودەتایی سالّی (١٩٨٠) لە ناوچەكانی باشوری رۆژهەلاّتی ئەنادۆلّدا زیاتر(٨٠٪) ی ناوی گوندەكان گۆڕدرا (٦٢،٢٥،٧،١٩٨٦ )، بە تایبەتی ناوی كوردی دەگۆڕدرا بۆ ناوی توركی، لەوانە لە كۆی ٥٥٨ گوندی ناوچەكانی ئاگری ناوی (٣٧٦)گوندی كوردی گۆڕدرا. لە وان لە (٤٢٦، ٢٨٩) گۆڕدرا. (٢٨٩) لە كۆی (٣٦٣) لە ویلایەتی موش، لە كۆی (٢٢٩، ٢٧٣)گوندی ناوچەكانی بیتلیس، هەموو ئەو كارانە بەناو و بیانووی ئەوەكران گوایا ئاسایشی ولاّت دەپارێزن .

لە سەرەتای نیسانی (١٩٨٦) دا چاپەمەنییەكانی توركیا بلاّویان كردەوە كە حكومەت دەستی بە جێبەجێكردنی پلانێك كردووە ئەویش یەكخستنی گوندەكان بوو لە دەوری یەكتری و سەرەتاش وا بڕیاردرا لە ویلایەتەكانی تونجەلی و سیرتەوە دەست پێ بكەن. بە رای حكومەت ئەم جۆرە یەكخستنی گوندانە دەبێتە هۆی باشتربوونی ژیانی ئابووری - كۆمەلاّیەتی خەلّكەكەو دەبێتە هۆی ئەوەی سەركەوتووانە دژی تیرۆریزم خەبات بكرێت ( ١٧،٣،٦٢، ١٩٨٦) .

لە پێناوی بنبڕكردنی تیرۆرتیزمدا بە قسەی سەرۆكی بەڕێوەری گشتی دەزگەی ئاسایشی توركی سەفێت ئاریكان بێدنی "حكومەتی توركیا ٢,٥ ملیار لیرەی توركی تەرخان كردووە بۆ ئەوەی هێزی تایبەتی توركیا لە یەدەگەكانی سوپا پێك بێنن وەك هێزێكی تایبەتی، دەبوایە لە دوای كۆتاییهاتنی حالّەتی دۆخی نائاسایی لە باشووری رۆژهەلاّتی ئەنادۆلّدا دابمەزرێن ( ١٧،١٨،٦٢، ١٩٨٦). بارودۆخی ناوچە كوردییەكان ئەوەندە گرژ و ئالّۆز ببوو هەر جۆرە باسكردنێك لە كێشەی كورد قەدەغەبوو، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا وردە وردە لەسەر رووپەری رۆژنامە توركییەكانیش باس لەو كێشەیە دەكراو لێدوانی دەربارە دەكرا . لە تەمموزی (١٩٨٧) دا نووسەری رۆژنامەی( جمهوریەت ) ئوگرو موجور نووسیبوی :

رووداوەکانی باشوری -رۆژهەلات تەواو جێگەی نیگەرانیە، ئەم رووداوانەی ئـەمرۆ بە جەنگێکی راستەقینە حسێب دەکرێـت . (١٤،لا، ٣٣٩) .لـە راسـتیدا حکومـەتی تورکیا هەوڵدانەکانی لە دژی تیرۆرزم بۆ ئەوە بوو کـە هێـزە کۆنەپەرسـتە راسـترەوەکان یەکبگرن بە مەبەستی پاساو هێنانەوە بۆ بۆچوونە دڕندانەکانیان دژی دەوڵەتانی دراوسێ و میللەتەکانی، دژی جولانەوەی نەتـەوەیی رزگـاریخوازی کوردەکـان، هـات و هـاواری تیرۆریزم بۆ راچلەکاندن بوو، بۆ ئەوە بوو حکومەت خەلکی تورکیای پـێ بلـەرزێت .بـۆ ئەوە بوو تا خەلکی لە کێشە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان هێور بکاتەوە، بۆ لاوازکردنی گرژی و ئالۆزی سیاسی بوو لە ولاتدا کە تا ئەو کاتە نزیکەی ٩ سالٌ بوو ئابلوقە و دۆخی نائاسایی لە ویلایەتەکانی دیاربکر، سیرت، ماردین، هەکاری، درێژەی هەبوو .

(١٩) ی تەموزی سـالی (١٩٨٧) دۆخـی نائاسـایی و ئابلوقــە هەلوەشـێنرایەوە . حکومەت بڕیارێکی دەرکرد کە هێزی یاسایی هەبوو، بــە گــوێرەی ئــەم بڕیــارە دۆخــی نائاسایی پارێزگەکان دروست کرا کە بریتی بوو لــە (٨) ویلایــەت، دیاربــەکر، سـیرت، ماردین، هەکاری، تونجەلی، وان، ئیلیازیگ، کە تا ئەوکاتە لە دۆخی نائاساییدا دەژیان. پارێزگەکان لەتەك ئەو دەسەلاتەی کە هەیانبوو دەسەلاتی راگەیاندنی دۆخی نائاسـاییان وەرگرت کە بە پێی یاسـا و بــە گــوێرەی مـادەی (١٢١) ی دەسـتوور دەکـرا لــەکاتی پێویستدا جێبەجێ بکەن.

ئەوی راستی بێت ئەم بارودۆخە هەر لە یاساکانەوە هەبوو، هــەر بۆیــە پارێزگــەکان هەر بەوەندە نەوەستان، بەلکو دەسەلاتی زیاتریان بەدەست هێنا، بەتایبــەت کــە دۆخــی نائاسایی ناوچەی پارێزگەکان ئەم دەسەلاتەیان بۆ زیادکرا :

١- ئامرازەکانی هاتووچۆی کارگەکان، بالەخانەکان، کەسانی پسپۆر و رێکخـراوی کۆمەلایەتی گشتیان خرانە ژێر فەرمان و دەسەلاتی پارێزگەوە .

٢- سەرکردایەتییکردنی ئۆرگان و بنکەکانی ئاسایشی ناوچەکە .

٣- بۆیان هەبوو داوای یارمەتی لە سوپا لە سەربازگەکانیاندا بکەن لە ناوچەکەدا .

٤- لەسەر کار لابردن و گواستنەوەی هەموو کەسێك، تەنها سـەرباز و جەندرمــەو دادوەرەکان نەبێ .

٥-گۆڕینی شوێنی گوندەکان و بە یەکەوە گرێدانی چەند دێیەك .

٦- ناچارکردنی ئەو هێزە سەربازییانەی کە لە ناوچەکەی ئەودان، ئەنجامدانی ئۆپێراسیۆنی سەربازی لە ویلایەتەکانی تری دراوسێدا .

٧- زیادکردنی مووچەی ئەو کارمەندانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا کاردەکەن بە ڕێژەی (١٠-٢٠%)موچەی بەرزترین کارمەندی دەوڵەت .

٨- سەرپەرشتییکردنی کێشەی هەر کارمەندێك کە لە ژێر دەسەڵات و فەرمانی ئەودایە. (٥٥،ژمارە،١٠٠،لا،١٠) .

بەم شێوەیە پارێزگەکانی ناوچەکانی ( رحالە گواری ) باری نائاسایی و دەسەڵاتێکی ئێجگار زۆریان لە دەست چڕیووە، بە تایبەت لەو ویلایەتانەی کە ناومان هێنان، ئەو دەسەڵاتانەش بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەی زەحمەتکێشان و جوڵانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردەکان بوو.

حکومەتی تورکیا لە قبوولکردنی ئەو بڕیارەدا کە هێزێکی یاسایی هەبوو، هەوڵی دەدا سیاسەتی شۆڤێنستانەی خۆی دژی کوردەکانی وڵات پێڕەو بکات . شایەنی باسە جێبەجێکردنی ئەم جۆرە دامەزراوە کۆلۆنیالیستانە لە لایەن حکومەتی تورکیاوە یەکەمجار نەبوو، چونکە لە ساڵی (١٩٢٧) یشدا ئەم جۆرە دەسەڵاتانە درابووە بەڕێوەری چاودێریکردنی گشتی کە لە ویلایەتە کوردنشینەکاندا جێبەجێ دەکران . ئەم ئۆرگانە ئیدارییە سەرکوتکەرانەیە تا نیوەی دووەمی ساڵانی سییەکان بوونی هەبوو. ئەم سیاسەتە دڕندانەیەی حکوموتی تورکیا لە لایەن وڵاتانی دەرەوە ریسوا کرا، بە تایبەت کاتێك سەرۆکی لیبیا م. قەزافی بە رادیۆ وتی:

( نابێ پشتگیری لەو کردەوانەی تورکیا بکرێت، هەموو میللەتانی جیهان لە دژی ئەو ئۆپراسیۆنەن، کوردەکان نەتەوەیەکن پێویستە رێزیان لێ بگرێت، پێویستە رێز لە مافی سەربەخۆیی و یەکێتییان بگیرێ) " ٦٨، ١٩٨٦، ژ،١٧،لا،٤ " .

لە شوباتی (١٩٨٦)دا لە کۆبونەوەیەکی گشتی (٤٢) ساڵەی دامەزراندنی کۆمیتەی مافی مرۆڤ لە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا گوتارێکییان خوێندەوە کە لەوێدا پشتگیری لە مافی مرۆڤ و مافی رزگاریخوازی میللەتان دەکرد، لەو وتارەکەدا

هاتبوو : دەوڵەتی تورکیا هەر لە سەرەتاوە سیاسەتێکی رەگەزپەرستانە پێڕەو دەکات ..... دان بە بوونی نەتەوەی کورددا نانێ. مافی داکۆکیکردن لە کولتوور و نەریت و قسەکردن بە زمانی کوردی لە گوتارێکی دیکەی سەنتەری ئەورووپادا سەبارەت بە جیهانی سێیەم هاتبوو:

چل ساڵ بەسەر راگەیاندنی بەیاننامەی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا تێپەڕیوە کەچی تا ئێستە دەوڵەتی تورکیا بوونی (١٢) ملیۆن کورد بە درۆ دەخاتەوە کە لە تورکیا دەژین :.. لە ژیانی رۆژانەدا کوردەکانی تورکیا نووسین و ئاخافتنیان بە زمانی دایك لێ قەدەغە کراوە، زەوتکردنی مافی کوردەکان بۆ دیاریکردنی داهاتووی خۆیان، لێدان و گورزێکە لە ئاشتی و ئاسایشی هەموو ناوچەکە دەکەوێت. ( ٦٨، ١٩٨٦، ژمارە،١٧،لا،٧ ) .

لە حوزەیرانی (١٩٨٧) دا لە سترازبورگ پەرلەمانی ئەورووپا لێدوانێکی لەسەر کێشەی کورد و ئەرمەنی کرد، لەوێدا دانیان بە بوونی کێشەی کورددا لە تورکیا نا کە پێویستی بە چارەسەرکردنێکی بە پەلە هەبوو. پەرلەمانی ئەورووپی بڕیاریدا: نکوڵیکردنی حکومەتی تورکیا و دان نەنان بە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان کە تورکە لاوەکان لە ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەمدا کردبوویان هەروەها ئامادەنەبوونی تورکیا لە قبووڵکردنی رێسا و بنەماکانی یاسایی نێودەوڵەتی، لە چارەسەرکردنی کێشەکان لەگەڵ یۆنان و داگیرکردنی قوبرس، خۆ گێل کردن و دان نەنان بە بوونی کێشەی کورددا لە تورکیا ئاماژەن بۆ نەبوونی دیموکراتییەتی پەرلەمانی و رێزنەگرتن لە ئازادی تاکەکەس و گروپە کۆمەڵایەتییەکان لە تورکیادا، هەموو ئەمانە دەبنە کۆسپ لە بەردەم بوونی تورکیا لە بە ئەندامبوونی لە یەکێتی ئەورووپادا. ( ١٤،لا، ٣٤٤ ) .

دوای پەسەندکردنی ئەم بڕیارانە لە لایەن پەرلەمانی ئەورووپاوە، کۆنەپەرستانی تورك ئاگریان گرت، دەستیان کرد بە پڕوپاگەندەیەکی بێ بناغە دژی ئەورووپا و کورد و ئەرمەن. هەر هەمان کات وایان بڵاوکردەوە کە ئەمە بڕیارێکی خیانەتکارانەیە لە ئەورووپا دەرچووە و بڕیارەکە نازیانەیە سەرۆکی تورکیا کەنعان ئێڤرین هەڕەشەی ئەوەی دەکرد تورکیا لە ناتۆ دەکشێتەوە . لەوەش زیاتر لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ رۆژنامەی(

حوریەت )لە (٢٧) ی تەمووزی (١٩٨٧) دا، زیاتر رووناکی خستبووە سەر کێشەکە. بە ئاشکرا حکومەتی تورکیا پشتگیری لە رۆژنامە و چاپەمەنییەکان دەکرد و جەختیان لەسەر مەترسی بەرامبەر بە تیرۆریزم دەکردەوە. ( ٢١،٧١، ٧١ ،١٩٨٧ ) .

لە شوباتی (١٩٨٧) دا حکومەتی تورکیا بە پشتبەستن بە مادەی یەکەمی یاسایی ژمارە ( ٣٣١٠ ) بە گوێرەی رێککەوتننامەی تورکیا - عێراق لە ساڵی ١٩٨٤دا بڕیاریدا ئۆپراسیۆنێك لە دەرەوە ئەنجام بدات ( ٥٠، ١٩٨٧ ، ژ، ٢٥ ، لا، ٥٦ ) .

لە سەرەتای ئازاری هەمان ساڵدا فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیا چەندین بنکە و بارەگەی هێزی پێشمەرگەی کوردستانی عێراقیان بۆمباران کرد. لە هەمان کاتدا حکومەتی تورکیا دەیویست فشار بخاتە سەر سوریا کە بە رایی تورکەکان چاوپۆشی و کار ئاسانیان بۆ کوردەکانی تورکیا کردووە لە کردنەوەی بنکە و بارەگاکانیان لەناو خاکی سوریا و هێرشبردنە سەر تورکیا .

لە دوای کودەتاکەی ساڵی (١٩٨٠) گرتن و راونانی کوردەکان زۆر زیاتری کرد و گورزی کوشندەیان لە کورد وەشاندە، لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی بە تەواوی جولانەوەی کوردی و پارت و رێکخراوە کوردییەکان لەکار بخەن .بۆ ئەوەی کار و کردارە ئیداری و سەربازییەکانی خۆی بە راست نیشان بدات حکومەتی تورکیا بە هاوکاری دەزگەکانی راگەیاندن هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەی بەرفراوانیان دژی کورد دەستپێکرد گوایە کوردەکان دەیانەوێ تورکیا پارچە پارچە بکەن و رژێمێکی کۆمەنیستی دروست بکەن، بەلام سەرانی تورك هەر بە پڕوپاگندە نەوەستان، بەڵکو لە نیوەی دووەمی ساڵانی هەشتاکاندا ئۆپەراسیۆنی سەربازییان دژی کورد زیادکرد، بە تایبەت کە لەو هێرشانەدا یەکە سەربازییەکان و هێزەکانی ئاسایش و کۆماندۆس و پاسەوانانی دێهاتەکانیش بەشدارییان لە سەرکوتکردنی جولانەوەی کوردیدا دەکرد .ئامانجی ئەم ئۆپراسیۆنە سەربازییانە تەنها دژی کورد نەبوو، بەڵکو بۆ لەناوبردنی هێزە چەپڕەوەکانی رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی ئەنادۆلیش بوو دەزگەی هەواڵی ئەنادۆڵ بەردەوام وا راهاتبوو کە سەرجەم رووداوەکانی دەخستە خانەی تیرۆریزم و هەڕەشەکردن لەسەر ئاسایشی ولات. بۆیە هەمیشە سیاسەتی میلیتاریزمانەی هێرشبەرانەی توندوتیژی لە دژی خەلکی بێ

دیفاعی ناوچەکە پێڕەو دەکرد . پاسەوانانی دێهاتەکان وەك هێزێکی نیزامی بۆ پاڵپشتیکردنی هێزەکانی ژاندرم و عەسکەر و کۆماندۆس و پۆلیس دروستکرابوون، هەر گوندەو (٢- ٣) پاسەوانی دێهاتی لێبوو. بە رایی نویزویك ژمارەی گشتی پاسەوانانی دێهاتەکان تا ئازاری ساڵی (١٩٨٧) گەیشتبووە (٦) هەزار ( ٦٤، ٣٠، ١٩٨٧ ) .

ئەم پاسەوانانە ( جاش-وەرگێڕ ) تەمەنیان لە (٣٢ تا ٦٠) ساڵ دەبوو، مانگی (٥٤) هەزار لیرەیان وەردەگرت کە نزیکەی (٦٧٠) دۆلاردەبوو. ئەمەش بۆ ئەوان پارەیەکی زۆر بوو . بە پێی نیزامی پاسەوانانی دێهاتەکان بۆیان هەبوو چەك بەکاربێنن :

١-دژی ئەو کەسانەی هێرشیان بۆ دێنن یان هەڕەشە لە ژیانیان دەکەن .

٢-لە کاتی کارکردندا ئەگەر ئەو هیچ ئامرازێکی تری نەبێ بۆ رزگارکردنی ئەندامی بنەماڵەکەی .

٣-ئەگەر بیەوێ گومانلێکراوێك دەستگیر بکات و ئەویش خۆی بەدەستەوە نەدا .

٤-ئەگەر بکوژێك دەستگیر کرابێت و هەوڵی راکردن بدات .

٥-ئەگەر کەسێك لە ناوچەی قەدەغەکراودا پەیابێ .

٦-ئەگەر پاسەوان لە پڕ بکەوێتە ناو کۆمەڵێ باندەوە .

ئەگەر پاسەوانی دێهاتەکان بەدەر لەم حاڵەتانە چەك بەکاربێنێت ئەوا دووچاری سزادان دەبێتەوە. کاربەدەستانی سیاسی و رۆژنامەکان و دانیشتوانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات و لەگەڵ هەندێ لە سەرۆك عەشیرەتەکان رەخنەیان لەو پرۆگرامە دروستکراوی پاسەوانانی دێهاتەکان گرت و لە بارەی کێشەی پاسەوانانەوە یەکێك لە رۆژنامەنووسان وتی : ئەمە کێشەیەکی ئێجگار سەختە کە پاسەوانانی دێهات زۆر لە جوتیاران دەکەن بەروبوومی گۆشت و پەلەوەر وەربگرن. لە حاڵەتێکدا حکومەت چەك بە لایەنێك دەدات گەر هاتوو لایەنەکەی تر جموجوڵەکەی راناگرێت، جوتیار بێدەسەڵاتە و ئازار دەچێژێت. من پێموایە دەوڵەت دەیەوێ دووبەرەکی بخاتە ناو گوندەکان، دەوڵەت و سوپا لەبەر ئەو کارانەی کە دەیکەن متمانەو باوەڕیان لە دەستداوە، بە تایبەت لە پڕچەککردنی گوندەکان ( ٢٥،لا،٢٧) .

کۆمیتەیـەکی کۆنگرێـسی ئەمـەریکا لـە (١٩٨٧) دا دەربـارەی چـاودێرییکردنی پێکهاتن و رێککەوتنی لادێیەکان سەردانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی کردبوو بە جۆرێك باسی سیاسەتی حکومەتی تورکیایان کردبوو لە کوردستان کە بە لـەناوبردنی نەتـەوەیی کورد شوبهاندبوویان .

لە ساڵی دا (١٩٨٦) و لە مانگی حوزەیراندا کارمەندە گەورەکانی دەوڵەت کە لـە ئینستیوتی ئاماردا کاریان دەکرد درانە دادگەی ئۆرگانەکانی ئاسایش و بـە تۆمـەتی ( جوداخـوازی ) تاوانبـارکران. چـونکە لـە بلانکێتێکـی سـاڵی (١٩٨٠) و (١٩٨٥) دا ئاماژەیان بە زمانی کوردی کردبوو کە دەیزانن، بلانکێتەکـە پرسـیاری وای تیـابوو بـۆ نمونە:

کام زمـان دەزانـی ؟ حـاکمی دەوڵـەتی بـەوە تاوانبـاری کردبـوو کـە یـەکێك لـە دیالێکتەکانی زمانی تورکییان بە زمانێکی سەربەخۆ داناوە. سـەرۆك پۆلیـسی بتلیس موستەفا توستۆن داوای کردبوو کە (١٢) کەس تاوانبار بکرێن بەوەی ناوی کوردییان لە منداڵەکانیان ناوە. بە بڕیاری کارمەندێکی گەورەی وەزارەتی نـاوخۆ ئەوانـە نـەك هـەر مادەی (١٦/ ٤) یاسای ژمارە (١٥٨) یان پێشێل کردووە، بـەڵکو لەگـەڵ کولتـووری نەتەوەییشدا ناکۆکە و بە ئیهانەکردنی رای گشتی دادەنرێت، جگە لەمەش ئەم ناوانە لە بەڵگەنامەی لە دایکبووندا تۆمار نـەکران. لەمـەش بترازێ حکومـەتی تورکیـا نـاوی گوندێکی زۆری کوردستانی گۆڕی و چاپەمەنییەکان باسیان لەوە دەکـرد کـە لـە پێـنج گونددا ناوی چواریان گۆڕا واتە لە (٣٥٢٤) گونددا ناوی (٢٨٤٢) گوندیان گۆڕی کە لە ویلایەتەکانی: ئەدریانا، غازی ئـەنتاب, مـاردین, ئورفـەن, سـیرت, دیاربـەکر بوون. (١٩٨٦/٢٥/٧١ ) لە مانگی سێپتەمبەری (١٩٨٨) دا کێشەی کوردبـوو بـە بابـەتی باسکردن و لێدوان لە ئەنجومەنی باڵای نەتـەوەیی تورکیـادا، محەمـەد علـی ئیرێـن کـە ئەندامی پەرلەمان بوو لەسەر لیستی پارتی گەلی سۆسیال دیموکرات بەدەر لە بەرنامەی رۆژانەی پەرلەمان باسی کوردی کردو وتی : کێـشەی کـورد ئـەمڕۆ وەك برینێکـی نـاو کۆمەڵی لێهاتووە رای گشتی نیگەران کردووە و پێویستە چاوخشانێکی هەمە لایەنە بەو کێشەیەدا بکرێت و رێگەیەکی هەمیشەیی بۆ ئـەو کێـشەیەی رۆژهـەڵات بدۆزرێتـەوە،

کوردەکان قسەکردنیان بە زمانی خۆیان لیٚ قەدەغە کراوە سیاسەتی تواندنەوە لە دژیان بەردەوامە ناوی دیهاتەکانی دەگۆڕێن, هاوولاتیان لە ڕۆژهەلاتدا ناتوانن بە ئازادی ناو لە منداڵەکانیان بنێن بۆیە پێویستە لەسەر تورکیا دیموکراسییەکی راستەقینە لە هەموو ولاتدا پیڕەو بکات (١٩٨٨/١/٢١/٧١) ئەم ووتارە بووە هۆی دەربڕینی نارەزایی لە لایەن نوێنەرەکانی پارتی نیشتمانییەوە، وەزیری ناوخۆ (مستەفا کەلاملی) وتی : جارێکی تر دەمەویٚ مادەی سێیەمی دەستوورتان بۆ بخوێنمەوە، تورکیا وەك دەولەت ولاتێکی یەکگرتووە و یەکپارچەیە و قابیلی پارچە بوون نیە،لە سەردەمی هێرش و پەلامارە سەربازییەکاندا کە دەسەلاتدارانی تورك ئەنجامیان دەدا زۆر لە گوندنیشنە کوردییەکان ناچارکران ولاتەکەی خۆیان چۆڵ بکەن و روو لە شارەکان یان ناوچەکانی رۆژئاوای تورکیا بکەن. ئەم پرۆسەیە سالانێکی زۆر درێژەی هەبوو. لە مانگی ئابی (١٩٩٠) دا لە ویلایەتی سیرت دانیشتوانی (١٧-١٨) گوندیان بە تەواوی یان زۆربەیان راگوێزران، بۆ ئەوەی خەلکەکە نەگەرێنەوە سەرتاپای گوندەکان وێرانکران. لە سالی (١٩٩٠) دا لە شارۆچکەی بەرواری لە ویلایەتی سیرت دانیشتوانی (٣٨) گوندو (٥٤) شوێنی نیشتەجێبوونی خەلك راگوێزران، هەر لە هەمان سالدا دانیشتوانی(٧٠) گوند راگوێزران، لە شارۆچکەی لیجەی ویلایەتی دیاربەکر گوندی حەدیك بە بیٚ دانیشتوان مایەوە.

(بابرلی سەید دۆغان) کە ریش سپی گوندەکە بوو وتی: زۆر لە جوتیاران لە ژێر هەرەشەی هێزەکانی ئاسایش ناچار بوون گوندەکە جێبهێلن و کۆچ بکەن، بە قسەی ئەو پیرەمێردە کە دەیگوت (هێزەکانی ئاسایش بە هەرەشەکردنەوە دەهاتنە لامان و لێیان دەپرسین کە پێیان بلێین لایەن گرانی(PKK) پارتی کرێکارانی کوردستان لە کوێن هەروەها دەیانگوت خۆ ئەگەر پێمان نەلێن ئەوا خراپتان بەسەر دێنین، هەندیٚ لەوانەی تۆقێندرابوون کە ئازاد دەکران بە هەموو هێزیان رایان دەکرد (٣١, لا ١٥٧,) لە سەرەتای (١٩٩٠) دا ئەو گوندانەی راگوێزران بەم شێوەیە بوو : -(١٧٥)گوند لە ویلایەتی سیرت, (٢٤) لە وان, (٤٨) لە هەماری (٣٩) لە تونجەلی, (١٠) لە ماردین، ئەگەر دانیشتوانی ئەو دێهاتانە بەرگرییان بکردبا ئەوا دووچاری بۆمباران وسوتاندنی

گوندەکانیان دەهاتن. سەبارەت بە بارودۆخی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات و چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان و خەبات و چالاکی پارتیزانەکان سەرۆکی فەرماندەی گشتی سیاسی تورکیا (نەجیب تورنتای) لە ناوچەکەدا لە ئابی (١٩٨٩) دابە نووسین راگەیاند کە لەشکری تورکیا سیاسەتی بەڕێوەبردنی ویلایەتەکانی لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵاتدا گرتۆتە دەست خۆیی و لە ژێر کۆنترۆڵی ئەودان (١٩٨٩/١١١/١٨/٧٢ ).

بە کورتی (نەجیب تورنتای)وتی :

١- هێزە چەکدارەکانی تورکیا تەماشای تیرۆریستەکان وەك دوژمنی خۆیان دەکەن، ناوچەکە بۆتە شانۆیەکی جەنگی پارتیزانی و بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی پێویست بە بۆچوونی عەسکەرییانەی شارەزا هەیە.

٢- ئەوەی هاوکاری تیرۆرستان بکات بە دوژمنی تورکیا دادەنرێت.

٣- بە دیل گرتنی خەڵکی بیانی کە لەگەڵ کوردەکانن مانای ئەوەیە جەنگی پارتیزانی گەشەی کردووە سنوورەکانی فراوان بووە.

٤- هێزە چەکدارەکانی تورکیا بۆیان ئاشکرا بووە کە جوداخوازەکان یارمەتی لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات وەردەگرن.

٥- ئەگەر هێزەکانی پۆلیس و ئاسایش تەواوی توانای خۆیان بخەنەگەڕ بۆ کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکە هێشتە ئەو کێشانە هەر دەمێنن، ئەمەش بەهێزی عەسکەری نزامی هەیە کە لە دژی تیرۆر ئامادە بکرێت و ئەوی لە هەرێمەکەدا بمێنێتەوە.

٦- سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی تورکیا ئەوە باش دەزانیّ کە چالاکی تیرۆرستەکان لە ناوچەکەدا بە زۆری پەیوەندی بە شێوازی پڕوپاگەندەی چەکدارانەو جەنگی دەروونییەوە هەیە.

٧- وەك ئاشکرایە هاوکاری لە کارکردندا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی تیرۆر لەگەڵ ئەوەشدا ئەو باوەڕە لای هێزە چەکدارەکان هەیە کە پێویست بەوە دەکات لە ماوەیەکی کورتدا لێدان بە دوای لێدان دەست پیّ بکرێت .

٨- سوپا دەزانێت چارەسەرکردنی سەرەکی کێشەکان لە باشوور و رۆژهەڵاتدا پەیوەندی بە بەرنامەیەکی چڕی حکومەت خۆیەوە هەیە بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ.

٩- ئەرکی سەرەکی سوپای تورکیا بریتییە لە نەهێشتنی ئەو هەڕەشەیەی کە لەسەر یەکپارچەیی خاکی تورکیا هەیە کە لەوانەیە لە ناوەوە یان لە دەرەوە سەر هەڵبدات .

١٠-بۆ ئەوەی هێزەکانی تورکیا بە ئامانجەکانی خۆی بگات بە گوێرەی توانا و بە زیانێکی کەم گورزی کوشندە بوەشێنێت ( ٢٤لا٢٦) لە ئابی (١٩٨٩)دا کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران کرا کە(تورنتای)وتارێکی دوور و درێژی دوای کۆبونەوەکەدا (تۆرگوت ئوزال) وتی : حکومەت هیچ بڕیارێکی سیاسی دەرنەکردووە تەنها کردەوە عەسکەرییەکانی بەهێز کردووە و چرای سەوزی بۆ سوپا داگیرساند. لە (٢١) ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٩) دەسەڵاتداران بانگەوازی کۆبوونەوەیەکیان بۆ سەرۆك عەشیرەتەکاندا، لەو کۆبوونەوەیەدا دە کەس بەشداربوون، یەکێك لە سەرکردە عەسکەرییەکانی سوپای تورك بە ناوی (ڕێجان ئوگورلوگو) بوو، لە کاتی کۆبوونەوەکەدا وتی: باس لە ڕۆڵی سەرۆك عەشیرەتەکان بکەن سەرکردایەتی سوپا قبووڵ ناکات سەرۆك عەشیرەتەکان لە تەك سوپادا چەك هەڵنەگرن ئەگەر وا نەکەن ئەوا بە لایەنگری (PKK) دادەنرێت و تووشی سزای قورس دەبێت ( ٥٤ و لا ١٩٨٩ ).

بە مەبەستی هێورکردنەوەی بارودۆخە سیاسییەکە، بە تایبەتی کە مەسەلەی کورد، بە تەواوی گرژی پەیداکردبوو، سەرۆك کۆماری تورکیا تۆرگۆت ئۆزال هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکەی بە ڕێگەیەکی ئاشتیخوازانەدا، بۆ ئەم مەبەستەش بەشێکی دیموکراتخوازانی ناو حکومەت و پەرلەمان و هێزە سیاسییەکانی تورکیای لەگەڵ بوو، بەڵام سەرکردایەتی سەربازی وڵات دژی وەستان. لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکاندا سەرانی تورك هەوڵیان دەدا نەك هەر دان بە بوونی کێشەی کورددا نەنێن، بەڵکو بە بوونی کوردیشدا لە تورکیا. بەڵام ئێستە ئەوان ناچاربوون کە دان بە گرنگی ئەو کێشەیەدا بنێن. بەم شێوەیە لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٠) دا نوێنەری سکرتێری گشتی پارتی گەلی سۆسیال دیموکرات (ئێردالْ ئینۆن) لە سەردانێکیدا بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات لە شاری (دیاربەکر) لە وتەیەکیدا وتی: کێشەی کورد کێشەیەکی دیموکراسییە لە وڵاتدا، هیچ پێویست بەوە ناکات خەڵك بە یەك زمان یان بە هەمان زمان قسە بکات لە

کۆبوونەوەیەکی تری جەماوەریدا هەر لە دیاربەکر ئێردالٚ ئینۆن ڕایگەیاند لەم ناوچەیەدا هەر کەسێك پێویستە بە ئارامی بە زمانی ڕەسەنی خۆی قسە بکات، ئێمە نابێ بەو کەسانە بلێین جوداخواز، دواتر ئەو بەلٚێنی ئەوەی پێدان کە ئەگەر لە حالٚەتێکدا حیزبەکەی دەسەلاٚت بگرێتە دەست ئەوا سەرمایەیەکی زۆر لە ناوچەکە دەخاتەگەڕ و لە هەمان کاتدا ئەوەشی ئاشکرا کرد کە بە توندی، دژی ئەو کەسانەش دەوەستێت کە بیانەوێت ولاٚت پارچە پارچە بکەن ( ٥٨/٧/لا١٩٩٠ ) لەو سەردانەدا بۆ ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەلاٚت، سکرتێری گشتی پارتی گەلی سۆسیال دیموکراتیش (وێنس بەیکالٚ) بەشداربوو، لە ئەنجامی سەردانەکەی بۆ ناوچە کوردییەکانی ولاٚت سەرکردایەتی ئەو پارتە وتارێکی ئامادەکرد کە باس لە بارودۆخی سەختی ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەلاٚتی ئەنادۆلٚ ئەکات و پێشنیازی ئەوەیان کردبوو لە قوتابخانەکاندا لە تەك زمانی تورکیدا زمانی کوردیش بخوێنرێت ( ٧١/١٣/٥/١٩٩٠ ) .

جگە لەمە سەرکردایەتی پارتەکە ئامادەیی خۆی نیشاندا چاو بەو بڕیارەدا بخشێنێتەوە کە پێشتر دابوویان سەبارەت بە دەرکردنی چەند ئەندامێکی ئەنجومەنی بالاٚی نەتەوەیی تورکیا کە بە نەتەوە کورد بوون و لە حیزب دەرکرابوون، چونکە لە(١٤-١٥) ئۆکتۆبەری (١٩٨٩) دا چووبوون بۆ پاریس بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەیەکدا بە ناوی «کورد مافی مرۆڤ و ناسنامەی کولتووری» لەگەلٚ ئەوەشدا حکومەتی تورکیا بەردەوام بوو لە سزادانی ئەو گوێنەگرانە و لە ئەنجامدا کۆمیتەیەکی تێکەلاٚوی یاسایی لە سەرەتایی ئایاری (١٩٩٠) دا پێکهێناو بڕیاریاندا حیصانەی پەرلەمان لەم ئەندامانە وەربگرنەوە:- تۆفیق کۆچاك، عەدنان ئێکنان، ئیبراهیم ئەڤسۆی، محمد علی ئێری، بە بیانووی ئەوەی کە ئەوانە پڕوپاگەندەی جوداخوازی و چالاکییان ئەنجامداوە بۆ پارچە پارچە کردن و دابەشکردنی تورکیا( ٥١/١١/٧/١٩٩٠ ).

لە ئازاری (١٩٩٠) دا تۆرگۆت ئۆزالی سەرۆك کۆمار مەرسومێکی دەرکرد بۆ ئەو پارێزگارانەی کە ناوچەکانیان باری نائاسایی دەیگرتنەوە و دەسەلاٚتی ئەوەی پێدابوون کە دانیشتوانی ناوچەکە لە شوێنی باو و باپیرانیان ڕاگوێز بکەن بۆ شوێنی تر، چاپخانەکان دابخەن و حوکمی زیندانییەکانیش دووجار زیاد بکەن، مەبەست لەو زیندانییانە ئەو

کەسانە بوون کە بە تاوانی جوداخوازی حوکم درابوون. ئەگەرچی ئەم دەسەڵاتدارە توندڕەوانە چەندین کاری تری ناڕەوای لەم بابەتەیان دژی کوردەکان ئەنجام دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا کێشەی کورد لە وڵاتدا لەوە دەرچوو بوو، بە شێوەیەکی گەلێ بەرفراوان و لە ئاستی جیا جیادا لێدوانی لەسەر دەرکرا. هەر سەبارەت بەم کێشەیە لە( ٥ ) ی تەمووزی (١٩٩٠) دا تورگوت ئۆزاڵ لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی (ئیزڤێستیای) سۆڤێتیدا وتی : کێشەکە کۆنەو زۆر ئاڵۆزە، ئەمڕۆ نەك هەر سەرنجی تورکەکانی ڕاکێشاوە بەڵکو سەرنجی کۆمەڵی جیهانیش، ئێمە ڕامان وایە کە ئەم کێشەیە تەنها بە ڕێگەی ئاشتیانەو یەکسانانە چارەسەر دەبێت و دەکرێ واز لەو ڕکەبەرایەتی و تیرۆر و بەرەڵاییە بهێندرێ. بەو شێوەیە بە درێژای مێژووی کۆماری تورکیا و بۆ یەکەمین جار لەسەر زاری سەرۆك کۆماردا دان بە بوونی کێشەی زیندووی کورددا بهێنرێ و ئاوات بۆ ئەوە بخوازێ کە بە ئاشتیانە چارەسەر بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆك کۆمار سەر لە نوێ ئاماژەی بەوەدا کە هەموو ئامرازێك بەکاردەهێنرێ لە پێناوی پاراستن و هێشتنەوەی یەکپارچەیی خاکی تورکیادا وتی پێویستە خەڵك بزانێ : هیچ هێزێك ناتوانێ و ئەوەی لەبار نیە یەکپارچەیی کۆماری دیموکراسی لەت بکات کە سنووری نەتەوەیی ئەو کۆمارە لە لایەن(ئەتاتورکی) بلیمەتەوە دیاریکراوە و نرخەکەی ژیان و خوێنی میللەتی تورکە و دووبارەی دەکەینەوە کە یەکپارچەیی کۆمار بە هەموو توانا و ئامرازێکییەوە داکۆکی لێدەکرێت. دیارە مەبەستمان لە چوارچێوەی دەستوورە و پشت بە دەستوور ببەسترێت هیچ ناگوترێت، چونکە دەستوورەکە خۆی بریتییە لە تەعبیرێکی شۆڤینیانەی یاساڕێژی سەرکردایەتی تورك دەربارەی کێشەی نەتەوایەتی، ئەم دەستوورە هیچ دۆخێکی تێدا نییە بتوانێ چارەسەری کێشەکانی تورکیا بکات. لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا سەرۆك کۆمار وتی: ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵات پێویستیان بە خستنەگەڕی سەرمایەداری هەیە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ و زیادکردنی پارە بۆ گەشەپێدانی ئابووری. لە ڕاستیدا هەموو توندوتیژییەکی نەتەوایەتی لە ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتدا پەیوەندی بە دواکەوتووییەوە هەیە لەبەرئەوە ئومێد دەکەم گەیشتن بە ئاستێکی خۆشگوزەرانی و شارستانییەتی کێشەکە خۆی لە خۆیدا چارەسەر بێت. ئەم

جۆرە دەربڕینەی سەرۆك ئەو مانایە دەگەیەنێ کە سەرانی تورك بەردەوامن لەسەر ئەوەی تەماشای کێشەی کورد نەکەن وەك کێشەیەکی نەتەوایەتی، بەڵکو وەك کێشەیەکی ئابووری تەماشای بکەن ئەمە لە کاتێکدا کە بارودۆخەکە بە شێوەیەکی دیکەیە و هۆشیاری نەتەوایەتی کوردی گەشەی کردووە و خەباتەکەش چالاکتر بووە لە پێناوی بە دەستهێنانی مافەکانیاندا و کۆمەڵی ئەوروپاش پشتگیری لەم مافانە کردووە کەچی هێشتە دەسەڵاتدارانی تورکیا ئەوەیان لە باردا نییە بتوانن بڕیارێکی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە ولاتدا بدەن. بە پێچەوانەوە حکومەتی تورکیا لە گرتنەبەری سیاسەتی ڕەشبگیری لە ناوچە کوردییەکاندا بەردەوامبوون. لە ئۆکتۆبەری (١٩٩٠) دا لە ناوچەکانی قزل تەپەی سەر بە ویلایەتی ماردین نزیکەی (١٥٠) کەسیان گرت و لە ناوچەکانی تریش بەم شێوەیەی خوارەوە بوو: ئولودێر(١١٠)، قۆرتەلانێ (٥٠)، بیسمێلا (٥٠)، شرناخ (٣٥٠) ، وان (٩٠)، قارس (١٢٠)، سیرت (١٠٠)، چوقەرجە (هەکاری )٥٠ کەس (٤،٧٥، ١٩٩٠ ). لە سەردەمی قەیران و جەنگی کەنداوی فارسیشدا حکومەتی تورکیا هەڵویست و سیاسەتی ئێجگار توندوتیژی بەرامبەر بە کێشەی کورد نواند. لەو قۆناغەدا تورکیا ژمارەی هێزە چەکدارەکانی کە لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتدا بنکە و بارەگایان دامەزراندبوو زیادیکرد بۆ (١٨٠) هەزار کەس. پێش ئەوەی عێراق کوێت لە ساڵی (١٩٩٠) داگیر بکات ژمارەی هێزەکانی تورکیا لەو ناوچەیەدا (٦٥) هەزار سەرباز بوو، جگە لە (٣٥) هەزار پۆلیس و جەندرمە کە لە ناوچەکەدا جێگیر کرابوون بۆ پاڵپشتیکردنی هێزەکانی سوپا. بە قسەی کۆزال چۆئۆغلو کە پارێزگەری ناوچەکانی باری نائاسایی بووە لەسەر حکومەت پێویست بووە کە خەرجی زیاتر دابین بکات بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی هەموو ئەو ناوچانە بکات تا دەگاتە سنوورەکانی تورکیا-عیراق کە مەوداکەی (٣٥٠) کم دەبوو. پارێزگەر وتی: خاڵەکانی پاسەوانان و دەوریەی سەربازی لە(١٠) کم سنوورەکانی تورکیا دادەنرێت و پێویستیان بە خواردەمەنی هەیە و ڕێگەو بانەکانیش لەو ناوچانەدا خراپن بۆیە دەبێ بە هەلیکۆپتەر کۆمەك بکرێن و ژمارەی سەربازەکانیش پێویستە زۆر زیاد بکرێت، چونکە شەو و ڕۆژ خەریکی چاودێری و ئێشکگرتن دەبن .

لە ساڵی (١٩٩١) دا لـە تورکیـا هەڵبـژاردنی پەرلـەمان پـێش کـاتی دیـاریکراو دەستپێکرد. ئـەوان کۆتاییـان بـە مۆنۆپـۆلی دەسـەڵاتی پـارتی پارێزگـەر هێنـا کـە دامەزرێنەرەکەی تورگۆت ئۆزال بوو. نزیکەی(٣٠٪) دەنگیـان بـە حیزبەکـەی سلێمان دێمیرێلدا. بەمەش پارتی پارێزگاران لەبەر چەندین هۆکارێك مۆنۆپۆلی پێشووی خۆی لە دەستدا لەوانە قەیرانی ئابووری - کۆمەڵایەتی و سیاسی لە وڵاتدا. بەم شێوەیە دێمرێـل یەکەمجار بـوو لـە دوای کودەتـا سـەربازییەکەی سـاڵی (١٩٨٠)دەرفـەتی بـۆ رەخسا حکومەتێکی ئیئتلافی دروست بکات ( ٢١،٤١،لا، ١٩٩١) .حکومەتی ئیتلافی نـوێ کە تازە دەسەڵاتی گرتبووە دەست هەر گوێی نەدایە رەخنەکانی ئۆپۆزیـسیۆن و هـەموو کارێکی دەکرد بۆ ئەوەی سیستێمی پاسەوانی گوندەکان بەهێزتر بێت لە ناوچەکەدا.

(سلێمان دێمرێل) دەیگوت: ئەم سیستێمە پارتی عەدالەت بۆی داناوین و ئێستەش هیچ بڕیارێك نیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی..( ٣١،لا،١٥٢ ) .

لەگەڵ ئەوەشدا حکومـەتی ئەنقـەرە سـەردانێکی بـۆ باشـووری رۆژهـەڵاتی وڵات رێکخست کە چاپەمەنییەکان ناویان نـابوو (مزەللـی) پەرەشوتیـست. لـەم سـەردانەدا (دێمرێل و ئینێۆن)، سەرۆکی فەرماندەیی گشتی سوپا(دۆغان) و چـەندین کاربەدەسـتی گەورەی تر بەشداربوون ئەمە جگە لەوەی گروپێکی بەرچاوی رۆژنامەنووسان هاورێیـەتی ئەم سەردانەیان دەکرد. ئەم سەردانە ئامانجی ئەوە بوو ئارامی و ئاسـایش بـۆ ناوچـەکە دابین بکات و پشتگیری خەڵکی هەرێمەکەش بە دەست بێن، بـەڵام رووداوەکـانی دواتـر دەریان خست سەردانی گەورە پیـاوان و کاربەدەسـتانی دەوڵـەت هـیچ جـۆرە ئاشـتی و ئارامییەکیان بۆ هەرێمەکە نەهێنا .

لــە کــانونی دووەمــی ( جـەنیوەری ) (١٩٩٢) دا حکومــەت بڕیاریـدا و بـاری شارستانی(١٥) هەزار کەسی گەڕاندەوە کە پێشتر حکومەت لێی زەوتکردبوون، چـونکە لە دوای کودەتاکەی(١٩٨٠) دا وڵاتیان جێهێشتبوو. بە قسەی وەزیری ناوخۆ (عیسمەت سیۆزگین)حکومەتی تورکیا هەوڵیداوە کۆتایی بـەو کـارو کردەوانـە بێنێـت کـە دەبنـە پێشێلکردنی بنەماکانی ماف و ئازادییەکان .

حکومەتی ئیتلافی کە لە نۆڤەمبەری (١٩٩١) دا دەسەڵاتیان گرتبووە دەست بەڵێنیان دابوو هەموو ئەو یاسایانە هەڵوەشێننەوە کە لە سەردەمی بەڕێوەبەرایەتی حوکمی عەسکەری سالآنی (١٩٨٠-١٩٨٣) دەرچووبوون ( ١٧،٤٦، ١٩٩٢ ) .

ئەگەر پێشتر سەرکردایەتی تورکیا دانییان بە بوونی نەتەوەیی کورد نەدەنا. ئەوا حکومەتی(سلێمان دیمرێل) بە رووکەش دانییان بە بوونی ئەم نەتەوەیەدا نا، بەڵام هەر بە قسە، لە تەك جەنگی راستەوخۆی کوردستان، حکومەت جەنگێکی نهێنی دژی رێکخراوە کوردییەکان بەرپاکردبوو کە بە ئاشکرا لە شارەکاندا کۆمەڵە و رێکخراویان دروستکرد بوو .

پۆلیسی نهێنی تورکیا بە نهێنی و بە دزی کوردیان لەناو تورکیادا دەکوشت. لە تەمووزی (١٩٩١) دا تا کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ زیاتر لە (٣٥٠) کوردی چالاکی بوارەکانی کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتییان لە پەناو پەسێودا کوشت.

کوردێکی زۆر لە ناوچەکانی شیرناخ، کولپە، ڤارێ، جزیرە کوژران ( ٤٤، ١٩٩٢،ژ،٤٨،لا،١٨ ) .

لە ساڵی (١٩٩٣) دا زیاتر لە هەزار کوردی کەسایەتی ناسراوی کۆمەڵایەتی و نووسەر و زانا و ئەندام پەرلەمان و ئەندامی پارتی دیموکراتی (محەمەد سنجار) کوژران ( ٤٣، ١٩٩٤ ،ژ،٥،لا،١٥ ) . پێویستە باس لەوەش بکەین کە پارتە بەناوبانگەکانی کوردی ئەو کات لە پەرلەماندا رۆڵێکی باشیان هەبوو لە دەوڵەتدا. لە وڵاتدا ئیتر میکانیزمی سیاسی ئەوەندە کارا نەبوو، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی سەرکردایەتی بوارەکانی(ئابووری، سیاسی، سوپایی) دەکرد و کۆنترۆڵیکردبوون، ئەم ئەنجومەنە چەندین سەنتەر و ناوەندی توێژینەوەی دروستکردبوو. لە واقیعدا حکومەت و پەرلەمان هیچ بڕیارێکییان بە دەستەوە نەمابوو، بەڵکو ئەوان تەنها فەرمانەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییان جێبەجێ دەکرد . ( هەمان سەرچاوە ، ژ،٣،لا،٢٥ ) . لە(١٧) ی نیسانی (١٩٩٣) دا (تۆرگۆت ئۆزال) لە پڕ دڵی وەستاو کۆچی دواییکرد ( ئۆزال سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو لە نێوان ساڵانی( ١٩٨٣ - ١٩٨٩ ) .

بە مردنی ئۆزال تورکیا یەك لە گەورەترین کەسایەتییەکانی خۆی لە دەستدا. دوای مردنی ئەو ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی رۆڵی سەرەکی لە بوارەکانی (ئابووری، سیاسی و کێشەی نەتەوایەتیدا) بینی بە تایبەت چارەسەرکردنی کێشەی کورد کەوتە دەستی ئەم ئەنجومەنە. بە گوێرەی هەواڵی چاپەمەنییەکان لە کۆتایی ئازاری (١٩٩٤) دا حکومەتی تورکیا دەوروبەری چیای ئاراراتی بە ناوچەی عەسکەری راگەیاند، هاووڵاتیانی مەدەنی ئەو ناوچەیە دەبوایە شوێنی ژیانی خۆیان چۆڵبکەن و بە جێیهێڵن، هەر کەسێکیش بە بێ مۆڵەت وەرگرتن لەو ناوچەیەدا ببیندرێ دەستگیر دەکرێ و لە شوێنی خۆی گوللەباران دەکرێت ئەم ناوچەیەی پێکدادان بۆ ئەوە دروستکرابوو، چونکە پارتیزانە کوردەکان لە دەرەوەی تورکیاوە دەخزانە ئەو ناوچەیە . ( ٤٦، ١١، ١٩٩٤ ) .(١٩) ی نۆڤەمبەری (١٩٩٤) دائەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا بڕیاری درێژکردنەوەی باری نائاسایی بۆ ناوچەکانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات پەسەندکرد بۆ ماوەی چوار مانگی تر .

بە گوێرەی هەواڵی دەزگەی ئەنادۆڵ کە باری نائاسایی تێدا درێژکرابۆوە ئەو شوێنانەی دەگرتەوە : (باتمان ، بەتلیس، بینگۆل، دیاربەکر، هەکاری، ماردین، سیرت، تونجەلی، وان) ، هۆکارەکەشی ئەوە بوو چونکە لەو ناوچانەدا چالاکی پارتیزانی کوردی تێدا بەهێز بوو. لە ناوەڕاستی ئازاری (١٩٩٥) دا ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا بڕیاری درێژکردنەوەی باری نائاسایی بۆ ناوچەکانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات پەسەندکرد بۆ ماوەی چوار مانگی تر بە گوێرەی هەواڵی دەزگەی (ئەنادۆڵ) کە باری نائاسایی تێدا درێژکرابۆوە ئەو شوێنانەی دەگرتەوە: باتمان، بەتلیس، بینگۆل، دیاربەکر، هەکاری، ماردین، سیرت، تونجەلی، وان، هۆکارەکەشی ئەوە بوو چونکە لەو ناوچانە چالاکی پارتیزانی کوردی تێدا بەهێزبوو.

لە ناوەڕاستی ئازاری (١٩٩٥) دا ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا باری نائاسایی بۆ ماوەی چوار مانگی تر لە (١٠) ویلایەتی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات راگەیاند. رێك لەو شارانەدا چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان چالاکیان دەنواند و لە ئابی (١٩٨٤) وە خەباتیان لە پێناوی بە دەستهێنانی مافە نەتەوەییەکان کورددا دەکرد. ئەم

جۆرە درێژکردنەوەی باری نائاساییە نزیکەی (٢٠) جار ڕاگەیەندرا. ئەمە مانای ئەوەیە کە لە باکووری کوردستاندا ڕژێمی کۆلۆنیالی دژی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد هەبووە.

لە کۆتایی حزیرانی (١٩٩٥) دا کۆبوونەوەی پارێزگەکان لە شاری (وان) ئەنجامدرا، ئەوانەی لە چوارچێوەی هەرێمی پارێزگەکانی باری نائاساییدا بوون. لەو کۆبوونەوەیەدا پارێزگەری هەرێمەکە (ئونال ئێرکان و حەسەن قۆنداغچی) کە سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی ناوچەکە بوون لەگەڵ (٣٠) پارێزگەی تری ویلایەتەکان لە چوارچێوەی باری نائاساییدا دەژیان. لەم کۆبوونەوەیەدا(ئۆناك) وتی: لە یانزە ساڵەی ڕابوردوودا تیرۆر وێرانکارییەکی زۆری بۆ هەرێمەکە هێناوە, حکومەتەکەمان هەنگاوی جدی دەنێن بۆ نەهێشتنی ئەو کاولکارییە. زەحمەتە بڵێین(ئۆناك) مەبەستی ئەوە بووە کاولکاری و وێرانکاری وەلاوە دەنێت، بەڵام وەك ئاشکرایە ئەو خەڵکانەی توشی ئازارو زیان بوون بە دەست جەنگ و پەلامارە سەربازییەکان و بە زۆر ڕاگواستنیان هیچ جۆرە یارمەتیەکییان لە حکومەتی تورکیاوە وەرنەگرتووە(٦٧, ١٩٩٥ , ژ\٧, ١\٣ ). بەڵێ حکومەت ئەم جۆرە ئەرکەی بۆ خۆی دانەناوە بە درێژایی ساڵانێکی دوور و درێژ جەندرمە و پۆلیس لە کوردستانی تورکیا بە شێوەیەك هەڵسوکەوتیان دەکرد کە لە ڕاستیدا وەك هێزێکی داگیرکەر وابوون. ئەوانەی بەشدارییان لە پەلاماری سەربازییدا دژی کوردەکان دەکرد بریتی بوون لە یەکە سەربازییەکان, جەندرمەکان, پۆلیس, پاسەوانی دێهات, هێزەکانی ئاسایش, هێزی تایبەت, ئامانجی ئەو هێزانەش تەنها ڕاونانی هێزە بەرهەڵستکارەکان نەبوو بەڵکو لێدان و لەناوبردنی هەموو ئەو هێزە نیشتیمان پەروەرانە بوو کە لە ڕۆژهەلاتی ولاتدا چالاکییان هەبوو. لە زۆربەی ڕاگەیاندنە ڕۆژنامەوانییەکانی کاربەدەستانی حکومەتدا, لە بارەی پەلامارە سەربازییەکانیاندا بەردەوام زاراوەی (تیرۆرستیان) پێوە دەلکاند، بەڵام قەوارەی هێرش و پەلامارە سەربازییەکانی تورك لە کوردستانی تورکیادا, قسەیەکی تر دەکەن، بۆ نموونە: لە ماوەی (١٠) ساڵدا لە کرداری سەربازییانەدا (١٥ ئابی ١٩٨٤-١٤ئابی ١٩٩٤) (٣٢) هەزار کەس کوژراون, لە ئەندامان و لایەنی حکومەتی تورکیا (٢٤,١٨٠)کەس, لەوانە(٦٤٢١٦) سەرباز ,(

٥٠٩) ئەفسەر, (٣٠٠٥) پۆلیس لە هێزەکانیش نزیکەی(٤٥٠٠) چەکدار کوژراوە. هەر لە ئەنجامی پەلامارە سەربازییەکانی سوپای تورک (٤٢٥٠) کەسی مەدەنیش کوژراون (١٥, ٨, ١٩٨٤) (٨,١٩٩٤) (١٩٩٤,ب.م).لەوانەیە ئەم ژمارانە بە تایبەت لە کوژرانی سوپای تورك زیادی پێوەنرابێ، بەلاّم لە ناوەرۆکدا شتێك ناگۆڕێ چونکە گشتییان گەواهی ئەوە دەدەن کە لە ناوچەکەدا لێدان و کوشتن و بڕینی توند هەیە و گەواهی لەسەر چالاکی پارتیزانە کوردەکان دەدەن.

حکومەتی تورکیا بە ئومێدی ئەوە بوو پەرلەمانی ئەوروپی ڕێککەوتننامەی ئەوروپی-تورکی لە بارەی یەکێتی گومرگ پەسەند بکات بۆ ئەم مەبەستە لە (٢٦ تەمووزی ساڵی ١٩٩٥) لە (١٧٧) مادەی دەستووری( ١٧) مادەیان هەموار کرد, کە لە لایەن ڕژێمی عەسکەری ساڵی (١٩٨٢) ەوە دانرابوون. سەرۆك وەزیران تانسۆ چیەلەر (١٩٩٣-١٩٩٥) ڕایگەیاند کە بە هۆی ئەو هەموارکردنانەوە تورکیا زیاتر دیموکراسی بووە, زۆر لەو مادانەی دەستوورەکە ( لە لایەن کۆمەڵی نێودەوڵەتییەوە ڕیسوا کراوە وەك: ماددەی ڕەشبگیری لە یاسای تاوان و یاسای دژە تیرۆردا) کە تا ئێستە پێڕەوکردنیان لە دەست نەداوە. ئەو دۆخ و بارەی لە سەرەتای دەستوورەکەدا هەیە هەروەك خۆی ماوە کە لە ڕاستیدا دان بە بوونی نەتەوەی کورددا نانێ. هەر لەم پێشەکییەدا بە تایبەت هاتووە و دەڵێ: سەروەری بێ قەید و شەرت بۆ نەتەوەی تورکە و نابێ هیچ ڕێگە بدرێت بە وتەو ڕاگەیاندن و بۆچونێك لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی تورك و لەگەڵ ئەخلاق و بەها و مێژووی تورکدا ناکۆك بێت, هەروەها نابێت ڕێگە بە بۆچونێك بدرێت لەگەڵ پرینسیپەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی و ئەتاتورکدا ناکۆك بێت.

لە مادەی دووەمی دەستووری کۆماری تورکیادا ڕاستەوخۆ دەڵێت: دەوڵەت پشت بە بیری نەتەوەپەرستی ئەتاتورك دەبەستێ, لێرەدا گرنگە باس لەوە بکەین کە ئەم دەستوورە هێشتە زۆر ناکۆکە و لەگەڵ دۆخی میساقی ئەوروپی لە بارەی مافی مرۆڤەوە ناگونجێ.

سەرباری ئەوەش ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا پێشنیازی نەهێشتنی (قەدەغەکردنی مانگرتن و لێکۆڵینەوەی توندی دژی ئەو کەسانەی سیاسەت دەکەن) ڕەت کردەوە.

ئێستە ئەو ماددە سەرەکییانەی دەستوور دەخەینەڕوو کە دژی دیموکراسین و حکومەتیش قبووڵی نەبووە لاببرێت یان هەموار بکرێت.مادەی (١٤): هیچ ماف و ئازادییەك نابێ بوونی هەبێ ئەگەر ئامانجیان تێکدانی یەکپارچەیی دەوڵەت و خاکەکەیی و دانیشتوانەکەی بێت, و ببنە مەترسی و هەڕەشە لە بوونی دەوڵەتی تورکیا و ببنە هۆی پەیدابوونی زاڵبوونی چینێك بەسەر چینێکی تردا, یاخود ببنە هۆی هێنانەکایەی فەرق و جیاوازی و چەوساندنەوە لەسەر بنەمای زمان, ڕەگەز, ئاین یان مەزهەب, یان دروستکردنی سیستێمی پۆلیسی لەسەر بنەمای ئەو چەمك و بۆچوونانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن.

ئەم مادەیە ڕێگرتنە لە هەر هەوڵێك بۆ دروستکردنی ڕێکخراوێ کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای نەتەوایەتی یان زمان بێت, بە وتەیەکی تر چینی کرێکار, گەلی کورد,

کەمینە نەتەوەیی و ئاینییەکان مافی ئەوەیان نییە ڕێکخراو دروست بکەن و تەعبیر لە بیروبۆچوونی خۆیان بکەن.

ماددەی( ١٥): لە حاڵەتی ڕاگەیاندنی باری نائاسایی یان هەڵگیرساندنی جەنگدا, جێبەجێکردنی ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکان سنووردار دەکرێت یان هەر نامێنێ.

ماددەی (٢٦): مافی تەعبیرکردن و بڵاوکردنەوەی بۆچوون و بیروباوەڕ لەوانەیە سنووردار بکرێت بۆ ئەوەی تاوان نەمێنێت و سزای تاوانباران بدرێت, نابێ ڕێگە بدرێت هەواڵ و دەنگوباسی نهێنی ئاشکرا بکرێن و بڵاوبکرێنەوە، کە نهێنی دەوڵەتن و دانیان پیانراوە یان بۆ ئەوەی ئەرکەکانی دەسەڵاتی دادوەری جێبەجێ بکرێت (واتا مەوقعی یاسا بەرقەرار بێت).

هەر زمانێك کە بەپێی یاسا قەدەغەکرابێت نابێ بەکاربێت بۆ تەعبیرکردن و بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکان.

ماددەی(۲۸): خەڵك دەتوانن کتێب بنوسن و مافی لە چاپدان و بڵاوکردنەوەشیان هەیە, بەڵام ئەگەر هاتوو ناوەڕۆکی نووسینەکان بریتیبێت لە هەڕەشەکردن لەسەر ئاسایشی ناوخۆ و دەرەوە یان هەڕەشە بێت لەسەر یەکپارچەیی خاکی دەوڵەت و خەڵکەکە و ڕووبەرەکەی یان ناوەڕۆکی ئەو نووسینانە هاندان بێت بۆ دروستکردنی ڕێکخراوی تاوانکارانە یان بۆ ڕاپەڕینی یاخیبوون دژی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت, ئەوا دووچاری لێکۆڵینەوەی دادگەیی دەبن بە گوێرەی یاسای چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە.

هەموو بڵاوکراوەیەکی وەرزی و یا هەر جۆرە چاپەمەنییەك لەوانەیە بە فەرمانی دەزگەیەکی دەسەڵاتدار قەدەغە بکرێت کە بە شێوەیەکی یاسایی دەسەڵات بەو دەزگەیە دەبەخشێ لە حاڵەتێکدا ئەگەر بینییان ئەو بڵاوکراوەیە زیانی بۆ یەکپارچەیی دەوڵەت هەیە.

بە بڕیاری دادگە چاپەمەنی و بڵاوکراوەی ڕۆژانە یان هەفتانە یان مانگانە دەوەستێنرێت ئەگەر نووسەرەکانیان تاوانبار کرابێت بەوەی ئەو شتانەی دەینووسێت یەکناگرنەوە لەگەڵ یەکێتی دەوڵەت و, بنەما و پرینسیپەکانی کۆمار, ئاسایشی نەتەوەیی, یان ئەخلاقی کۆمەڵایەتی. هەموو چاپەمەنییەك بریتی بێت لە درێژەپێدانی ئەو چاپەمەنییەی کە ڕاگیرابوو, دەبێ قەدەغە بکرێت یان بە بڕیاری دادگە دەستی بەسەردا بگیرێت.

ماددەی (۳۰): چاپخانەو کەرەستەکان دەستیان بەسەردا ناگیرێ ئەگەر کارمەند و فەرمانبەرەکانیان گوناهبار نەکران بە کاری تاوانباری دژی یەکپارچەیی خاکی دەوڵەت یان لە دژی بنەما و پرینسیپەکانی کۆماری یان ئاسایشی نەتەوەیی، بەڵام لە وڵاتدا ئەم کارە بەردەوام پێشێلکراوە.

ماددەی (۳٤): ئۆرگانی تێکەڵاو (مەبەست لە دەزگە سەرکوتکەرەکانە) دەتوانێ کۆبوونەوەی لابەلا و خۆپیشاندان تا دوو مانگیش دوابخات ئەگەر وا پێشبینی بکرێت کە ئاژاوەی لێدەکەوێتەوە یان ئاسایشی نەتەوەیی تێکدەدا یان چالاکی دژی بنەماو بناغەکانی کۆمار ئەنجام دەدات. ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراو و سەندیکایانەی کە لە چوارچێوەی یاسادا دروستکراون نابێ کۆڕو کۆبوونەوە و خۆپیشاندانی وا بکەن ژمارەیان

زۆر لەوە زیاتر بێت کە خۆیان هەن و لەو قەوارەیە تێپەڕێت کە لە بەرنامە و ئامانجی خۆپیشاندانەکە یان کۆبوونەوەکەدایە.

ماددەی (٤٢): لە خوێندنگەکاندا جگە لە وانە وتنەوە و خوێندنی بابەتی زانستی و کاری زانستی و مەنهەجی خوێندن کە بۆیان دیاریکراوە نابێ هیچ کارو چالاکییەکی تر ئەنجام بدرێت. جگە لە زمانی تورکی نابێ هیچ زمانێکی تر لە وانە وتنەوەدا بەکاربهێنرێ و قسەپێکردنی ئەم زمانە وەك زمانی رەسەنە بۆ هاوولاتییانی تورك.

ماددەی (١٣١): حکومەت پێویستە سەرکردایەتی و چاودێری زانکۆکان بکات و ئاسایشییان بۆ دابینبکات... زانکۆ و ستافی مامۆستایان و یاریدەدەرەکان بە ئازادی دەتوانن کاری زانستی و توێژینەوەی زانستی ئەنجام بدەن, بەلام نابێ ئەم کارانە دژی بوونی سەربەخۆیی دەولەت و یەکپارچەیی و یەکێتی نەتەوەیی ولات بێت. ماددەی(٨): لابردنی یاسای دژە تیرۆر ئەو یاسایەی کە:- هەموو جۆرە ڕاگەیاندن و بلاوکراوە و دۆکۆمێنتێکی قەدەغە کردبوو کە دەبوونە هۆی ڕێگە خۆشکردن بۆ(پڕوپاگەندەی جوداخوازی) یان پیاهەلدانی ڕێکخراوێك کە بە یاسا قەدەغەکرابوو. بەلام لایەنە سیاسییەکان کە حکومەتی تێکەلاویان دروستکردبوو نەیانتوانی چارەسەرێکی مامناوەندی بۆ هەلوەشاندنەوەی ئەو ماددەیە بدۆزنەوە.

جگە لەمەش سەرکردە گەورەکانی سپاش لای خۆیان ڕایانگەیاند کە دژی هەلوەشاندنەوەی ئەو مادەیەن.

دوای ئەمە, پرۆژە یاساکە لە خشتەی کارەکانی ڕۆژانەی پەرلەماندا لابردرا. ئەمە لە کاتێکدا کە زۆر لە دۆخەکانی دەستوور دەسەلاتی بێ سنوورییان داوەتە جەنرالەکان، تەنانەت لە کاتی حکومڕانی مەدەنیشدا هیچ حکومەتێکی مەدەنیش زاتی ئەوەی نەکردووە لە شکۆی سوپاو ئەو ئیمتیازانەییان بێبەش بکات. بە گوێرەی دەستوور دامەزراوەکانی دژە دیموکراسی بەردەوام بوون لە درێژەپێدانی کارو چالاکییەکان. بەم شێوەیە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کە زۆربەی ئەندامەکانی لە ئەفسەرە پایەبەرزەکانی سوپا پێکهاتبوون, توانای ئەوەیان هەبوو ئەنجومەنی وەزیران بە بڕیارەکانی خۆیان ببەستنەوە. خەسلەتی کۆنەپەرستانەی مادەکانی( ١٢, ١٢٢), لە

بواری عەسکەری و نائاساییدا هەر مابۆوە تا ساڵی (١٩٨٧) یش کاری پێ دەکراو باری نائاسایی لە ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتدا ڕادەگەیەنرا.

مادەی (١٢٢): ئەنجومەنی وەزیران کە کۆبوونەوەکانی خۆی لە ژێر سەرکردایەتی سەرۆك کۆمار بەڕێوە دەبات, دەتوانێ دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی باری نائاسایی لە ناوچەیەك یا چەند ناوچەیەك یان لە تەواوی وڵاتدا ڕابگەیەنێ.

لە قۆناغی دۆخی جەنگدا ئەنجومەنی وەزیران لە ژێر سەرپەرشتیکردنی سەرۆك کۆماردا کۆبوونەوەکانی خۆی دەکات و دەتوانێ لە بارەی ئەو کێشانەی کە پەیوەندییان بە باری عەسکەرییەوە هەیە یاسا دەربکات. ئەو کەسەی کە بەرپرسی دۆخی عەسکەرییە پێویستە ئەرکەکانی خۆی لەژێر کۆنترۆڵی سەرۆکی فەرماندەیی گشتییەوە جێبەجێ بکات. شایانی باسە هیچ کام لەم مادانەی کە پەیوەندییان بە دادگەکانی ئاسایشی دەوڵەتەوە هەبوو نەگۆڕدران.

مادەی (١٤٣): دادگەکانی ئاسایشی دەوڵەت بۆ لێکۆڵینەوە لەو بابەتانە دروست دەکرێن کە دژی پارچەکردنی خاك و دەوڵەت و نەتەوەی تورکیا ئاراستە کراون, دژی پێکهاتەی ئازادی و دیموکراسی کۆمار ئاراستەکراون یان ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ئاسایشی ناوخۆ و دەرەوەی دەوڵەتەوە هەیە. لە حاڵەتی باری ڕاگەیاندنی نائاساییدا ئەم دادگەیانە لەوانەیە بگۆڕدرێن و ببن بە دادگەی سەربازی.

بە گوێرەی ئەم مادەیەو لە بارودۆخی تورکیادا, دادگەکانی ئاسایش سەدان کێشەی تاوانییان بەسەر نیشتمانپەروەرانی کورددا سەپاندووە، لە هەمان کاتدا دژی ڕۆشنبیران بوون بەو تۆمەتە تاوانبار دەکران کە بۆچوونی جیاوازییان هەیە و لەگەڵ بیروباوەڕی دەوڵەت ناگونجێ و زیانی هەیە, ئەمانە گشتییان حوکمی جیاجیایان بەسەردا سەپێنرا و ئازادییان لێ زەوت کرا .

لە (٢٠) ئۆکتۆبەری (١٩٩١) دا هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا دەستی پێکرد, لە ئەنجامدا حکومەتی( سلێمان دێمیرێل و ئینیۆنیو) دەسەڵاتیان گرتە دەست. لە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنەدا( ٢١-٢٢ ) کورد کورسی پەرلەمانییان بەرکەوت,

جگە لە (٧) نوێنەری تر کە گوایا بێلایەنن. بە گوێرەی سەرچاوەیەکی تر (١٨) نوێنەر لە ئەندامی پێشووی پارتی گەلی کار هەڵبژێردرابوون, هێشتا پێش سوێند خواردنیان چاویان بە ئینونۆ کەوتبوو نامەیەکییان پێدا بوو کە لە بیست مادده پێکهاتبوو کە بریتیبوو لەو مەرجانەی ئەوان دایانناوە بۆ ئەوەی بێنە ناو پارتی سۆسیال - دیموکراتی گەلی، مادەکانیش ئەمانە بوون:-

١-دانان بە بوونی نەتەوەی کورددا لە دەستوور و یاساکاندا بە پێی واقیعی سۆسیۆلۆجیای تورکیا .

٢-رەتکردنەوە و کێشانەوەی ئەو دۆخانەی کە لە رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا کراوە لەسەر حسابی هەبوونی نەتەوەی کورد بۆ پشتگیریکردنی تورکیا .

٣-بۆ ئەوەی چەمکی هاوچەرخانەی نەتەوەی کورد دەستنیشان بکەین پێویستە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بە نووسین و قسەکردن زمانی کوردی ئازاد بکرێت و بە کولتووری کوردی بدرێت و قوتابخانە بە زمانی کوردی بکرێتەوە، هەروەها رادیۆ و تەلەفزیۆنیشیان بۆ دابین بکرێت .

٤-دۆخێکی دیموکراسیانە بخولقێندرێ بۆ ئەوەی لە هەموو ئاست و بوارەکاندا لێدوان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی کوردی بکرێت.

٥-راگرتنی باری نائاسایی بە هەموو پێکهاتەکانییەوە .

٦- هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارانەی کە حوکمی قانوونیان هەیە .

٧-کێشانەوە و لابردنی هێزی تایبەتی سەربازی لە هەرێمەکەدا ( کوردستانی تورکیا ).

٨- هەڵوەشانەوەی رێکخراوی دژە گریلاو ( دژی پێشمەرگە ) لەناوبردنی .

٩- لابردن و هەڵوەشاندنەوەی سیستمی پاسەوانی دێهات .

١٠- قەدەغەکردنی بەکارهێنانی یاسای دژە تیرۆر .

١١- هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی(١٢) ی ئەیلول و راگەیاندنی لێبووردنی گشتی بێ مەرج.

١٢- دابینکردنی بارودۆخی وا لە زیندانەکاندا کە لەگەڵ بنەماکانی مافی مرۆڤ بگونجێ، ڕێگەدان بە ئەندام پەرلەمانەکان سەردانی زیندانییەکان بکەن و کۆنترۆڵییان بکەن و جێگەی زیندانییەکان بەسەر بکەنەوە .

١٣- ماوەی حجزکردن کەمبکرێتەوە بۆ (٢٤) سەعات، لێکۆڵینەوە لەگەڵ کەسی گیراودا پێویستە بە ئامادەیی پارێزەر بێت .

١٤-ئاشکراکردنی ئەو تاوانانەی کە ئاشکرا نەکراوە و سزادانی ئەنجامدەرانی .

١٥- دەرکردنی یاسایی عادیلانە لە بارەی هەڵبژاردنەوە .

١٦- سەر لە نوێ دروستکردنەوەی ئەو دێهاتانەی کە وێرانکرابوون و سوتێنرابوون یان بە زۆر چۆڵکرابوون لەگەڵ قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی کە بەر خەڵکەکەی کەوتووە.

١٧- ژیاندنەوەی جێگەکانی پەیوەندی بەرهەمهێنان کە پێشتر لەناوبرابوو، هەڵوەشانەوەی یاسا لە بارەی گوند و دێهاتەکان .

١٨- داننان بە مافی سەندیکەکان بۆ مانگرتن و بەستنی ڕێککەوتننامەی هاوکاری .

١٩- بە یاساکردنی مانگرتنی گشتی، مافی مانگرتن و مانگرتنی وەك سیمبولی سۆلیدارێتی. هەڵوەشاندنەوەی ڕاگەیاندنی توندوتیژی .

٢٠- بە دیموکراسیکردنی دەستوور، هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، ملکەچ بوونی فەرمانداەیی گشتی بە وەزارەتی بەرگری.( ٣٦ ، لا ، ١٧٤ ، ١٧٥ ) .

دوای ئەوەی ئەندام پەرلەمانەکان ئەم بیرخەرەوەیان پێشکەش بە( ئینۆن) کرد کۆبوونەوەیەك ڕێکخرا بۆ ئەوەی بە گوێرەی مادەی (٨١) ی دەستووری تورکی بڕیارێکی سوێندخواردن بدەن و دواجاریش سوێندخواردنەکە بەم شێوەیەك بوو:

بە ناوی نەتەوەی تورکی بلیمەت، سوێندبێت بە شەرەف و ویژدانم داکۆکی لە بوون و سەربەخۆیی و دەوڵەت و یەکپارچەیی نیشتمان و نەتەوە بکەم، داکۆکی بێ قەید و شەرت و مەرج لە سەروەری نەتەوە بکەم، پابەندی یاسایی باڵا و دیموکراسی و

علمانییەتی کۆمار بم، پابەندی پرینسیپەکان و وەچەرخانە شۆڕشگێرییەکەی ئەتاتورك بم، لە ئیدیالّی (میپالی) پێشکەشکردنی ئارامی و خۆشگوزەرانی بۆ ئەندامانی کۆمەلّ لانەدەم، پابەندبم بە یەکێتی و عەدالەتی نەتەوەیی، لانەدەم لە بەکارهێنانی ماف و بنەماکانی ئازادی مرۆڤ ، هەر بە دلّسۆزی بۆ دەستوور بمێنمەوە . ( ١١،لا،١٢ ) .

لە (٥) ی نۆڤەمبەری (١٩٩١) دا یەك ڕۆژ پێش ئەوەی بە رەسمی سوێند بخۆن، نوێنەرانی یان پەرلەمانتارەکانی سەر بە پارتی کاری گەل لەناو ئەنجومەن و هۆلّی پەرلەماندا کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەگەرییان بەست کە لە ناویاندا نوێنەری دیاربەکر(فەهی ئیشلکەر) بوو وتی : (ناوەرۆکی ئەم سوێند خواردنە بوونی نەتەوەی کورد رەت دەکاتەوە لەگەلّ دیموکراسی مافی مرۆڤ و ئاشتی و برایەتی گەلی کورد و تورکدا ناکۆکە ) .( ٥١ ،٦، ١١، ١٩٩١ ) .

ئەندامانی پەرلەمان کە سەر بە لیستی پارتی کاری گەل بوون و بە لیستی پارتی سۆسیال دیموکراتی گەلی تورکیا هەلّبژێدرابوون رایانگەیاند کە ئەوان لەژێر فشاری دەستووردا ئەو سوێندە دەخۆن . وتەکانی هەردوو پەرلەمانتاری سەر بە پارتی کاری گەل کە بە زمانی کوردی بوو لە کاتی سوێند خواردنەکە بووە هۆی نارەزایی توند لە لایەن سەرۆکی پارتی سۆسیال دیموکراتی گەل و ئێردال ئینۆن و سەرۆك کۆمار (تۆرگۆت ئۆزال) و ......هتد .

لە درێژەی سیاسەتی رەشبگیری و سەرکوتکردنی نیشتمانپەروەرانی کورددا دادگەی ئاسایشی دەولّەت لە ئەنقەرە لە (٩) ی ئۆکتۆبەری (١٩٩٣) دا دەستی بە پرۆسەی دادگەییکردنی پارتی دیموکرات کرد. حکومەتی تورکیا پارتی دیموکراتی بەوە تاوانبارکرد کە پڕوپاگەندە بۆ پارچە پارچەکردنی ولاّت دەکات. ئەو ولاّتەی کە بە هیچ جۆرێ خۆی و نەتەوەکەی قابیلی لێکترازان نیە.

دەسەلاّتداران داوایان لە دادگە دەکرد ئەندامانی پارتی دیموکرات بە مادەی(٩و٢٠) ی یاسای ژمارە (٣٧١٣) ی دژی تیرۆریزم تاوانبار بکات. دادوەر بڕیاریدا یەشا کایە( ١٠) سالّ بە گوێرەی مادەی (٩-٢٥) لە یاسای ژمارە( ٢٨٤٥ ) و مادەی (١-٨ ) ی یاسای تیرۆریزم زیندانی بکرێت. دواتر یەشار کایە دوای( ٨٢ ) ڕۆژ زیندانی لە (٨) ی

دیسەمبەری ساڵی (١٩٩٣) دا لە کۆبوونـەوەی دادگـەیی ئاسایـشدا ئـازادکرا .پـارتی دیموکرات کە بە دۆخێکی سەختدا تێپـەر دەبـوو (١٤) ئەنـدامی شـارەوانی و پارێزگـە بڕیاریاندا ببن بە ئەندامی ئەم حیزبە. ئەمەش وا لێکدرایـەوە کـە پـشتگیری سیاسـی و پشتگیری جەماوەری لەم پارتە دەکەن .لە راستیدا رەوشی وڵات بە جۆرێك گرژببوو کـە کاربەدەستتان ورەیان نەمابوو، چونکە زەرەر و خەسارەتێکی زۆریـان لـەوە کردبـوو کـە کێشەی کورد بە بێ چارەسەر مابۆوە. لەو بار و رەوشەدا و لە نۆڤەمبـەری (١٩٩٣) دا کۆمەڵەی پیشەسازان و سەرمایەدارانی تورکیا روویان لە حکومەت کردوو داوایان لێکرد کێشەی (تیرۆر) لە وڵاتدا چارەسەر بکات، چونکە هێشتنەوەی ئەم کێشەیە هەروا بـەبێ چارەسـەرێکی ئـابووری وڵات تووشـی لـەرزین دەکـات. لـە راگەیاندنەکـەدا هـاتبوو سەرمایەدارانی تورکیا زۆر نیگەرانن لەوەی کە لـە نێـوان کـورد و تورکـدا پێکـدادانی ترسناك هەیە و تا دێت فراوانتر دەبێت. هـەر بۆیـە پێیـان وابـوو کـە پەرلـەمان دەبـێ خەریکی دانانی بەرنامەیەکی بەهێزبێت بۆ چارەسەرکردنی ئـەو کێـشە کۆمەڵایـەتی و نەتەوەییە توندوتیژە . بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو قەیرانەشدا پێویست بە دانانی یاسای گونجاو دەکات بۆ ئەوەی لە رۆژهەڵاتی وڵاتدا ئەو بارودۆخە نـەمێنێ، رێگـە چارەی دووەم بـە بۆچوونی سەرۆك حکومەت بریتییە لە پێکهێنانی هێزێکی سەربازی ئەوتۆی کۆماندۆس کە تایبەت بێت بۆ ئەوەی لە هەرکات و ساتێکدا و بەپەلە بەرپەرچی تیرۆرستان بداتەوە و لە هەموو خاڵە گەرمەکانـدا وێـرا بگـا و ڕاویـان بـنێ ( ١٥ ، لا ، ١٢٨ ) سـاڵی (١٩٩٤) دا هەڵبژاردنی دەسەڵاتی ناوچەکان دەستیان پێکرد کە لە ژێر چاودێری سوپادا بەڕێوە دەچوو. (PKK) فەرمان یدا خەڵکی دەنگ بەو هەڵبژاردنە نـەدەن و بەشـداری تێدا نەکەن، پارتی دیموکراتیش بە هەمان شێوە بڕیاریـدا بەشـداری لـەم هەڵبژاردنـەدا نەکات، چونکە پێشتر بەر ڕەشبگیری بەرفراوانی لەشکری ئاسایشی تورك کەوتبوون، ئەم بانگەوازە بێ وەڵام نەمایەوە، بەڵکو لە کوردستانی تورکیادا زیاتر ئەو کەسانەی مـافی دەنگدانییان هەبوو پشتیان لە هەڵبژاردنەکە کرد، بە پێی یاسای تورکی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکاندا زۆرەملییە واتە هەموو ئەوانەی مافی دەنگدانییان هەیە و دەبێ بەشدار لە پرۆسەی دەنگداندا، ئەوەی نەچێ دووچاری سزا دەبێتەوە ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە

لە تیرۆری دەوڵەت .لە ئازاری (١٩٩٤) دا حکومەتی تورکیا مافی پاراستنی ئەندامێتی پەرلەمانییان لە گروپێکی پەرلەمێنتاری کوردی سەر بە پارتی دیموکرات سەندەوە ( خەتیب ،دیجلە، ئۆرخان دۆغان، ئەحمەد تورك، لەیلا زانا، سپڕی ساکیك، سەلیم سادق، مەحمود ئەلنق) ئەوانە لەو گروپە بوو کە زۆرترین دەنگییان بە دەستهێنابوو لە هەڵبژارنەکانی شارەوانی و دەسەڵاتە لۆکالییەکانی ئەو ناوچانەی کە کوردی تێدا دەژیا، ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکیا مافی پارێزراوی ئەندامێتی پەرلەمانییان لێسەندنەوە تەنها لەبەرئەوەی لە پێش هەڵبژاردنەکان و لەناو پەرلەماندا باسی کێشەی کوردییان کردبوو .هەموو ئەو تاوانانەی کە ئەو پەرلەمانتارانە کردبوو یان وەك لە ناوەڕۆکی حوکمەکەدا دەردەکەوێ کە دەسەڵاتدارانی تورك ئاراستەیانی کردبوو، تەنها باسیان لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد کردبوو لەسەر بنەمایەکی دیموکراسی، هەندێ لەو تۆمەتانەی کە خرابوونە پاڵ ئەندام پەرلەمانەکان بە رووکەش هەر زۆر ناکۆکبوون، بۆ نمونە: ( لەیلا زانا) بەوە تۆمەتبارکرابوو کە لە کاتی پرۆسەی هەڵبژاردنەکەدا ڕەنگی ئاڵای کوردستانی لە جلوبەرگەکانی خۆیدا بەکارهێنابوو، هەموو ئەمانە زۆر بە قووڵی و توندی پێشێلکردنی بنەماکانی مافی مرۆڤە کە لە لایەن کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بڕیاری لەسەر دراوە، پێشێلکردنی ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتییە لەبارەی مافە سیاسی و مەدەنییەکانی مرۆڤەوە کە بۆی زامنکراوە جا لە هەر شوێنێك بژی ( ٤٣ ، ١٩٩٤ ، ژ ، ٧ ، لا ، ١٤ )(نوری باتور) لە وتارێکیدا لە هاوینی ( ١٩٩٤ ) دا * کە لە رۆژنامەی (میللەتدا) بڵاوی کردبۆوە سەبارەت بە رووداوە سیاسییەکانی تورکیا لەوە ئاگاداری کردبوونەوە کە سەرۆکەکانی وڵات لەم دواییەدا هەندێ ئاگاداری وایان داوە کە زەرەری زۆریان بە تورکیا گەیاندووە. قسەکە زیاتر لەسەر زەوتکردنی مافی پارێزراوی کوردەکانی ئەو پارتانەن کە سەر بە حکومەت نین، (نوری باتور) ئەوەشی وتبوو کە تورکیا ناتوانێ حساب بۆ ڕای دیموکراسییانەی ئەورووپا نەکات و دەبێ گۆڕانکاری بەرچاویش لە دەستووردا بکات لە پێناوی پاراستنی مافەکانی مرۆڤدا ( هەمان — سەرچاوە — ١٩٩٤ — لا ٦ لا ٨ ) هەر ئەو کاتە سەرۆکی(CIA) پاوەڵ کە لە تورکیا لە شاری (خەنزە) بوو لە تەمووزی(١٩٩٤) دا وتی: دەوڵەتی تورکیا وەك چۆن

لە رابردوودا ناوەندی بوو هەرواش دەمێنێتەوە، ئەگەرچی کێشەی کورد کێشەی سەرەکی تورکیایە، دەکرێ چارەسەر بکرێ، بۆ ئەمەش پێویست بە سەرکردایەتییەکی سیاسی تێکەڵاو دەکات کە ناکرێ کێشەی کورد بە رێگەی عەسکەری چارەسەر بکرێت، پاول لە درێژەی قسەکانیدا وتی: پێویستە رێگەچارەی سیاسی بۆ ئەو ململانێیە بدۆزینەوە ( هەمان سەرچاوە ١٩٩٤ ، ژ٦ ،/ لا ٩ ) (سەکین سریەنجی )کە یەکێکە لە هەرە سەرمایەدارە گەورە و ناودارەکانی تورکیا لە وتەیەکیدا لە بەرەو رووی جەماوەری (دیاربەکر) پێشنیازی ئەوەی کرد کە ئەزموونی ئیسپانیا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەکاربهێنرێ لێرەشدا مەبەستی لە باسکەکان بوو، کە کوردیش وەك ئەوان لە تورکیا ئۆتۆنۆمییان پێبدرێت .ئەم راگەیاندنانە راستەوخۆ لە دوای ئەوە کرا کە راپۆرتێکییان بڵاوکردبۆوە تیایدا هاتبوو: تورکیا ناتوانێ لە رێگەی سەربازییەوە چارەسەری کێشەی کورد بکات، سەرمایەدارەکە ئەوەشی وت کە پێش ئەوەی سەرمایە بخرێتەگەڕ بۆ ناوچەکە پێویستە هێمنی و ئارامی تیایدا بەرقەرار بێت و سیاسەتمەندارانی بەوە تاوانبارکرد کە تا ئێستە نەیانتوانیوە سەقامگیری لە ناوچە کوردییەکاندا دابین بکەن .ئەو پیاوە حسابی ئەوەی نەکردبوو کە قسەکانی لەلایەن دادوەری دادگەی ئاسایشی دیاربەکرەوە تۆمارکراوە و بە تێکدەر قسەکانی لێکدراوەتەوە. (سریەنجی) وەك تاوانبار لە دادگە داوای لەسەر تۆمارکراو بە پێی یاسای دژە تیرۆر و بە پێی مادەی ( هاندان و ئاژاوەنانەوەی نەتەوایەتی ) هەڕەشەی زیندانی لێکرا. ئەم جۆرە یاسایە کۆسپی سەرەکییە لەسەر رێگەی تورکیا بۆ بوونی بە ئەندام لە یەکێتی گومرگی ئەوروپادا. لەبەرئەوە پەرلەمانی ئەوروپی داوایانکرد بە زووترین کات ئەو یاسایە لاببەن کە پێشێلکەری مافی مرۆڤە و رێخۆشکەری سزادانی هەموو جۆرە بیروباوەڕێکی جیاوازە . ئەوسا تورکیا بە دەست قەیرانێکی نەتەوەیی گشتییەوە دەیناڵاند کە بێ شك ئەنجامی جەنگێکی دڕندانەی ساڵانێکی دوورو درێژ بوو کە لە کوردستاندا بەرپایان کردبوو. سەرهەڵدانی ئەم جۆرە قەیرانە بووە هۆی ئەوەی( تانسۆ چیلەر) ی سەرۆك وەزیران لە ساڵی (١٩٩٥ ) دا دەست لەکار بکێشێتەوە. لە ژێر رۆشنایی قسەکانی پێشوومانددا دەتوانین بڵێین کە لە نیوەی یەکەمی ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا و سەرباری

هەموو سیاسەتی کۆنەپەرستانەی حکومەتی تورکیا لەگەڵ ئەوەشدا پارتی سیاسی ئۆپۆزسیۆنی سەر بە کورد بە ئاشکرا وەك خاوەن ڕێکخستنێکی بەهێز سەری هەڵدا و بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کۆماری تورکیادا توانی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەی تورکیا بەکاربهێنێ بۆ بەرژەوەندییەکانی جوڵانەوەی نەتەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانی باکوور. ئەم کێشەیە خەسڵەتێکی نێودەوڵەتی بەخۆوە گرت کاتێك شەش ئەندام پەرلەمانی نەرویژ سیاسەتی ڕژێمی تورکیای دژ بە کوردییان ڕیسواکرد و بەردەوامبوون لە پشتگیریکردنی ورەی پەرلەمانتارە کوردەکان و ئەنجومەنی باڵای نەتەوەی تورکیا و پێشنیازی ئەوەشیان کرد خەڵاتی( نۆبڵ )پێشکەش بە( لەیلا زانا) بکرێت بۆ ئەو کارانەی کە لە پێناوی ئاشتیدا نواندبووی.( لەیلا زانا) کە ئەندامی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەی تورکیا بوو لەسەر لیستی پارتی دیموکرات لە دیسەمبەر و لە کانوونی یەکەمی (١٩٩٤) دا بۆ ماوەی (١٥) ساڵ حوکمی زیندانی لە لایەن دادگەی تورکیاوە بەسەردا سەپێندرا ( ٤٢ ، ب/م ، ١٩٩٥ ،ژ٢٥) بەمجۆرە تورکیا لە دۆخێکی سەختدابوو کە دواجار کەلێنێکی دۆزییەوە بۆ ئەوەی هەندێجار لە ماددەکانی دەستووری وڵات بگۆڕێ و مکیاجیان بکات. دوای دوو هەفتە لێدوان و قسەکردن لەسەر هەمووارکردنی (٢١) ماددەی پێشنیازکراو تەنها(٥) ماددەیان هەمووارکرد. ئەگەر داواکارییەکانی ئەورووپا لە هەمووارکردنی ماددەکانی دەستووری تورکیا جێبەجێ نەکرێت، ئەوا بە پێی هەواڵی ڕۆیتەر پەرلەمانی ئەورووپا ئامادە نییە پشتگیری لە ڕێککەوتننامەی گومرگی لەگەڵ تورکیادا بکات (٤٣ ، ١٩٩٥ ،ژ ، ١٠ ، لا ، ٢٥ ) .

*هێزەکانی تورکیا بە ڕێکەوتن لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا، هاتبوونە ناو خاکی کوردستانی عێراق، بە هیچ جۆرێ دووچاری شەڕ و پێکدادان نەهاتن لەگەڵ هەروەها چەند ڕۆژێك پێش دەستوور لە چەندین شاردا دەستیان بە گرتن و ڕاونانی خەڵك کرد. حکومەت هەڕەشەی لە خەڵك دەکرد ئەوەی دەنگ نەدا بۆ ماوەی شەش مانگ زیندانی دەکرێت ئەم جۆرە هەڕەشەلێکردنە جۆرێك لە ترس و دڵەڕاوکێ و نائارامی خستبووە دڵی خەڵکەوە .

*هێزی پ.م، چونکە ئەو کاتە هێزەکانی (پ.د.ك) ئەوەندە لاواز بوو تەنها پێیان دەکرا خۆیان لە شەڕ بە دوور بگرن نەك بەرگری بکەن، نووسەر لە نووسینی ئەم بابەتە ئاماژەی بە هیچ سەرچاوەیەك نەکردووە کە ڕۆڵی نێودەوڵەتی ئەم پەلامارە عەسکەرییەی تورکیای مەحکوم کردبێ، بە تایبەت کە ڕەزامەندی حکومەتی عێراقی لەسەر بووە. تەنها (ی.ن.ك)و هێزەکوردییەکان ڕیسوایان کرد .( وەرگێڕ)

# ئەنجام

لە دیسەمبەری (١٩٩٨) دا وەزارەتی دەرەوەی تورکیا بانگەوازێکی بۆ میللەتانی ئەوروپا لەژێر ناوێکی ئیستفزازی ( تیرۆریزم PKK) دا ئامادەکرد.

( ٤، ١٩٩٨، لا، ٥٥-٤٤) ئەم دەکومێنتە بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە کارو چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا باس لە هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی تورك دەکات سەبارەت بەوەی داخوا کێشەی کورد بوونی هەیە لە تورکیا ؟ ئایا بەکارهێنانی زمانی کوردی لە تورکیا قەدەغەیە ؟ لە خوارەوە بە کورتی ناوەڕۆکی ئەو دەکومێنتە دەخەینە ڕوو .

لە دەکومێنتی یەکەمدا هاتووە :

(دەوڵەت جیاوازی لە نێوان هاوولاتییاندا بە ماکی نەتەوەیی ناکات و باس لە وابەستە نەتەوەییەکان ناکات لە کاتی سەرژمێرییەکانی هاوولاتییاندا لە تورکیا و هیچ حساب بۆ ڕەگەز و خاڵی نەتەوەییان نەکراوە. بەڵام ئەمە هیچ کات رێگر نەبووە لە بەردەم هاوولاتییانی ئێرەو ئەوێ لە روانگەی دەستنیشانکردنی چەمکی نەتەوەیی کە خۆیان بە چی دەزانن یان سەر بە کام نەتەوەن ئەمە کارێکە پەیوەندی بە تاك خۆیەوە هەیە و تەواو بوارێکی کەسێتییە. راگەیاندنی ئاشکرای ئەمانە کە سەر بە کام ڕەگەزی نەتەوایەتین ئەوا نە بە یاساو نە بە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان قەدەغە نییە، سیاسەتی فرە حزبی و ئازادی هەڵبژاردن کە دەسەڵاتی لۆکالی خۆبەڕێوەبردن بەهێز دەکەن بە خەسڵەتێکی دیموکراسییانەی ژیانی تورکیا دەژمێررێت. دەوڵەت و میللەت لە لایەن دەستووری تورکیاوە لە یەکتر جیانابنەوە، یەکسانی هاوولاتییان بەرامبەر یاسا بێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەزی ئاینی و نەژادی و (ئیتنیکی) نەتەوەییان بە هۆکاری مێژووی و کولتووری و بە گوێرەی پابەندییەکانی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان سەبارەت بە

چەمکی کەمینە ) بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ هەندێ گروپی لابەلا بەکاردێت کە موسوڵمان نین. هاووڵاتییانی ئێمە کە بە ڕەگەز و نەژادی نەتەوەیی بە کورد دادەنرێن دووچاری چەوساندنەوە نابنەوە و هەستدەکەن ئەندامێکی یەکسانی کۆمەڵگەن و زۆر لەوانە پۆستی بەرزییان لە کۆمار وەرگرتووە، ئەوان توانایەکی یەکسان و چارەنووسێکی هاوشێوەی باقی تری دانیشتوانی وڵاتیان هەیە. لە جوگرافیای سیاسی تورکیادا فاکتەری نەتەوەیی هیچ رۆڵێکی نییە بۆ نمونە بەشی هەرە زۆری هاووڵاتییانی تورکیا بە ڕەگەز کوردن لە ڕۆژئاوای وڵات دەژین. زۆربەیان لە( ئەستەمبوڵ ) نیشتەجێبوون، تەنانەت لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا هاووڵاتییانی تورکیای بە ڕەگەز کورد بە زۆرینە حسێب ناکرێن، دروستبوونی دەوڵەتی سانای (موحدە) (ساکاری) یەککگرتوو تەعبیر لە یەکسانی و یەککگرتووی ناوچە جوگرافیاکانی جیاجیای تورکیا دەکات. لەبەرئەوەی تورکیا ناتوانێ لە هەوڵ و کۆششی کوردەکان تێنەگا و پەسەندی نەکات و لێدوان و رێز لە هەوڵە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییە یاساییەکانی نەگرێ وەك ئەوەی هاووڵاتییانی تورکیا کە ڕەگەزی نەتەوایەتییان کوردە بریتیین لە کۆمەڵێکی لابەلای تر. ئەوان بەشێکن لەو میللەتەی کە چەندین سەدەیە هاوبەشن لە زمان و بەها و ئاین و کولتوور و نیشتیمانپەروەری، مێژووی هاوبەش دادەنرێت. دانیشتوانی باشووری-ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ وەك تەواوی دانیشتوانی بەشەکانی تری وڵات لە ژیانی سیاسی تورکیادا بەشدارن: لە ڕێگەی هەڵبژاردنی نوێنەرەکانییان ئەوان بە ئازادی خۆیان لەبارەی بەڕێوەبردنی خۆیان لە ناوچەکاندا ڕادەگەیەنن لە شارەوانی و پەرلەمان و لە حکومەتی ناوەندیدا.

بنەماکان و مافی ئازادی گشتی هاووڵاتییانی تورکیا بە شێوەیەك دابینەدەکرێ کە لەگەڵ دۆخی دەستووردا بگونجێ.هیچ یەك لەو هاووڵاتییانەی کە بە نەتەوە کوردە و بەشداری کاری سیاسی دەکات و لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا تەعبیر لە کوردبوونی خۆی دەکات نە دەچەوسێنرێتەوە و نە ئیهانە دەکرێت و نە ڕاودەنرێت هەرچەند تاوانباریش کرابێت بەبێ پێچەوانە لەم بوارەدا. بەڵام کار و ڕاگەیاندن دژی یەکپارچەیی خاکی تورکیا

بەپێی یاسا دووچاری لێپرسینەوە دەبێت (٤, لا, ٣٠, ٣٠). لە دەکومێنتی دووەمدا هاتووە:

بە پێچەوانەی هەندێ لەو کوردانەی کە پێشوەخت حوکمی خۆیان دەدەن لە تورکیا هیچ سنوورێك دانەنراوە بۆ بەکارهێنانی زمانی جیاجیا، ئەمڕۆ لە تورکیا لە سەرانسەری وڵاتدا چەندین رادیۆ و تەلەفزیۆنی جیاجیا هەن و تایبەتن لە بڵاوکردنەوەی چۆن بە زمانی تورکی ئاواش بە دیالێکتی جیاجیای زمانی کوردی. پێویستە باس لەوەش بکەین کە زمانی کوردی زەحمەتە بە زمانێکی یەکگرتوو دابنرێ. چۆن لە بواری زانستی زمان و ئاواش لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە زۆر لە زانایان جەخت لەسەر ئەو بەڵگەیە دەکەنەوە کە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیادا زۆر زمان و دیالێکتی ناوچەی جیاجیا هەن وەك زازا و کرمانجی کە لێکچوونەکانی نێوانییان لە لێکچوونی نێوان فەرەنسی و ئینگلیزی زیاتر نیە. ئەو زمان و لەهجە ناوچەییانە ئەوەندە لە یەکتر دوورن کە خەڵکی گوندێك ناتوانێ لە دانیشتوانی گوندێکی دراوسێی خۆی حاڵی ببێ، هەر بۆیە پەنا دەبەنە بەر زمانی تورکی وەك زمانی یەکگرتووی نێوانیان بۆ یەکتر تێگەیشتن و حاڵیبوون. زمانی رەسمی لە تورکیا زمانی تورکییە، بەڵام زمانەکانی وەك ئەرمەنی، یۆنانی، دیالێکتی جیاجیای کوردی و لە تەك زمانەکانی تر لە ژیانی رۆژانەدا بە ئازادی هەڤپەیڤییان پێدەکرێ، بەڵام لە وڵاتدا تەنها یەك زمانی فەرمی هەیە کە ئەویش تورکییە.

هەروەها دەبێ بگوترێ کە تەعبیرکردن لە پێوەندارێتی(إنتماى) نەتەوەیی وەك بەکارهێنانی زمانی ناوچەیی وەك کارێکی کەسی و تایبەت تەماشا دەکرێت. لەبەرئەوە ئەم پرسە لە یاسارێژیدا (تشریع) باسی لێوە ناکرێ و لە لایەن دەوڵەتیشەوە رێکناخرێن .

زمانی تورکی بە زمانی کۆماری تورکیا دادەنرێت، لەبەرئەوە بە تاکە زمانی فەرمی خوێندن و نووسین دادەنرێت. زۆربەی وڵاتە دیموکراتییەکانیش هەروان . ئەگەرچی توانایی گەشەپێدانی زمانە ناوچەییەکان هەیە، هەروەها دیالێکتەکان بە رەسمی بکرێنە زمانی دەوڵەت بەڵام ئەمە واقیعی نیە و ناگونجێ. ( ٤ ، لا ، ٣٢ ).

لە درێژەی سیاسەتی کۆنەپەرستانەی تورکیا دەربارەی کێشەی کورد لە ئەیلولی (سێپتەمبەر ) ساڵی (٢٠٠١ ) پەرلەمانی تورکیا یاسایەکی لە بارەی زمانەوە

